خودا، واحید ئەتۆی، تۆم بێ شەریکی
لە ئەولاد و لە دای و باب تەریکی
خودا هەر تۆی سەمەد، تۆم بێ نیازی
لە مەجلیس و لە دیوان وُ لە قازی
ئەتۆی خالەق، هەموو مەخلووقە عالەم
ئەتۆی رەززاق، هەموو مەرزووقە عالەم
بە ئەمری تۆ دەچەرخێ ئەو مەدارە
هەموو یەک لەجێی خۆی بەرقەرارە
لە نوور بالاتری بێ جیسم و جانی
ئەوان مەخلووقی تۆن، تۆ کەی لەوانی
لە شەو پەیدا دەکەی رۆژی مونەووەر
بە بەرگی شەو دەپۆشی رۆژی ئەنوەر
ئەگەرچی خالەقی کەون و مەکانی
خودا تۆ لامەکان و لا زەمانی
لە وەسفتدا بلیمەت بێ زمانە
لە چۆنی تۆ هەموو زانا نەزانە
دەزانێ شێت و ئاقڵ، ژیر و وریا
کە ناگونجێ لە حەوزا ئاوی دەریا
ئەتۆ چۆنی و چلۆنی خۆت دەزانی
دەزانم خالەقی چەرخی زەمانی
لە دینی تۆ خودا چاو ناتەوانە
سرشکی عەشق و ئەندووهی رەوانە
وەهات فەرموو بە مووسا تۆ لەسینا
لە حاندی من کە نابینایە بینا
لە زاتی ئەقدەسی تۆ زەڕڕە نووری
نیشانت دا بە شاخ و کێوی تووری
لەگەڵ وِی هەستی کرد کێو نووری یاری
گڕی گرت بوو بەکۆی زووخاڵ بەجاری
لەبۆ شاە و گەدا ودەروێش ئیلاهی
ئەتۆی مونعیم، ئەتۆ پشت و پەناهی
لە دەرکی کیبریایی تۆ خودایە
گەدا سولتان و شایە، شا گەدایە
ئەگەرچی وەک کەفی بەحرە گوناهم
لەچاو دەریای رەحمی تۆ ئیلاهم
لە قەترەش کەمترە ومەئیووس لەرەحمەت
نەبووم ،نابم ، کەخۆت فەرمووتە وەعدەت:
لە غەیری موشریکان هەرکەس مەیل کەم
دەبوورم لەو گوناهی پاکی سەرجەم
خودایە عالم و بینا و بەسیری
لە چەند و چوون لە من چاتر خەبیری
وەتی کوو من موکەللەف بووم خودایە
وتەی زارم خودایە رەببەنایە
بەدەست تۆیە خودا ریشە وئەساسم
بە تەنیا هەر ئەتۆ بەخودا دەناسم
ئەتۆی رەحمان خودا هەر تۆم رەحیمی
بەسەر ئەفکار و ئەحواڵم عەلیمی
ئەتۆی رەحمەرحەمی و تەنیا خودایی
ئەتۆی شایانی تەمجید وسەنایی
بکە رەحمێ بە "لوتفی" ئەی خودایە
کە هەر دەرگاهی رەحمی تۆی پەنایە

# نێوەرۆک

## سەروتار

سلاو لەخوینەرانی بەرێز:

لە ژمارەکانی پێشوودا لەسەر دەوری زانست و دەستکەوتەکانی زانستی لە ژیانی مرۆڤ دواین و پێوەندی نێوان بارەکانی سنعەت و تکنۆلۆژی و دەستەلاتی دنیاخۆرانمان باس کرد ولێرەدا ماینەوە کە ئێستا دەبێ ئێمە چ بکەین و چ ئەرکێکمان بەستۆیە؟ یا لەحاند ئەم قەیرانە کە لە لایەن داندرانی سیاسەتی رۆژهەلات ورۆژئاواوە پێک هاتووە تەکلیفمان چیە؟

بێ شک دوو ئەرکی گرینگمان لەسەر شانە. یەکەم بەرەنگاری یەکی بەجێ وسەرەکی وهەموولایەن لە بەرامبەر هێرشی ئیستکبارە ( هەڵبەت بۆ بەرگری لەبنەگری وجێگری و تەنەوەی هەرێمی دەستەلاتی سیاسەتی کۆڵەداری) . بە راشکاوی دەبێ بڵێین، ئەگەر لەم بارەوە خۆ تەیار نەکەین ولە کەمتەرخەمی و

خافلاندن ووەستان وستـــی
خۆ نەپارێزین نـەک هـەر
ناتوانین بەرپەرچی پەلاماری
دنیاخۆران بدەینەوە و مافی
لەدەست چووی گەلانی زۆرلێکراو
بستێنینەوە بەڵکوو هەل و
دەرفەت سات بە سات پتر
لەدەست دەچێ و زۆرتر خم
دەشێوێ وئالۆزتر دەبێ .

**"زێدەویستن کە لە زاتەوە وێڕای زوڵم ودەست درێژی یە، دەبێتە هۆی ئەوە کەسنووری بەراستی مافی گەلان لـەبـەر چاو نەگیرێ و بکەوێتە بەر پەلامار و ئـەگـەر رێـی دەست درێژی و پاوانخوازی چەوسێنەران بەربەست نەکرێ سەربەخۆ بوونی هەموو گەلان بەراستی لە جاران پتر دەکەوێتە بەر مەترسی."**

وەک ئەوە کە ئیمڕۆ شایەدی خۆ تێوەرنەدانـی بەشێکی زۆر لە خـەڵکیـن و سەرسپێراوی رێبـەری سیاسی وهیندێک جارئایینیش لە جیهانـی سێهـەمـدا دەبینین. ئەگەر ئەم بارە نالەبارە درێژەی هـەبێ دیمەنی داهاتووی ژیانـی بەشەر وای دەست بەسەردا دەگیرێ کە لەچاو ئێستـا دەبێ بۆی بگری .

لەمنێوەدا سەرکـەوتـن بۆ ئەو گەلانەیە کە بە مەعریفەت و ناسینی هەل و دەرفەت وبردنەسەری پلەی روانینی سیاسی و پشـت بەستن بەرێبازی ژینەرەوە و رزگاری دەری محەممەدی(د.خ) بەیەکگرتووی زانستی وئیمـان بە نەفس وبڕوا بـــە سەرکەوتنی نیهایی و بـە کەلک وەرگرتن لە هێـزی خۆراگری و بەرگری و لە بەرامبەر دەعوەتی کڕنـووش بەرانەی فیرعـەونـەکانی زەمانەدا "نا" بلێ و لە بەرامبەر ملهوڕی ئەوانـدا وەک شێر رابوەستێ و لە هەڕەشەیان نەترسێ وپاشە— کشە نەکا .

هەموو گەلێک دەبـێ بزانێ کە رەزا دان بـە هەل ومەرجی حازر بەراستی رەزادانە بە نابووتـی چونکە تەماحی جارلە جار پتری کۆڵەداری کە بەپێی قانوون و زاکوونی جەنگەڵ و بڕوا بە «اَلْحَقُّ لِمَنْ غَلَبَ» قەت بەوەندە رازی نابێ و دەست هەڵناگرێ .

بەم پێ ودانە خۆراگری و راوەستان وخەبات دژی کۆڵەداری ودەست وپێوەندی ئەوان لە دوو لاوە پێویستە .

یەکەم: بۆ ئەوە کە وەزعی داهاتوو لە ئێستا بشێوتر نەبێ.

دووهەم: مافی خوراو بستێندرێتەوە.

بێ شک لە بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە ولەبەر خاتری ئەوە کەزانست دەوری دیاری کەری لە سازکردنی نیزامی دەستەڵاتداریدا وبە قەدر و هێزکردنی زۆرداراندا هەیە دەبێ ئەم چەکە لەدەست دوژمنی دین ودنیای خۆمان دەربێنین وزۆر بەجێ کەلکی لێ وەربگرین و نیـری کۆیلەتی زەلیلانە لەئەستۆی گەلە زۆر لێکراوو بـێ بەشەکانی لە بەند کراو و دواکەوتوو داڕنین .

ئەوە کە ئێستا زانست لەخزمەت شەبەکە جیهانـی — یەکانی ئیستعمار دایـە لەبەر تایبەتی جەوهەری ئەو نیە، بەڵکوو گەلاڵەی هەراو و حیسێب کراوی نیزامی دەستەڵاتدار ودەست وپێوەندی بەکرێگیراوی ئەوان ئەم بارەی پێک هێناوە کەوێڕای پێشکەوتن لەباری زانست وسنعەتەوە

**ئەگەر رێی دەست درێژی وپاوانخوازی چەوسێنەران بەربەست نەکرێ سەربەخۆبوونی هەموو گەلان بەراستی لەجاران پتر دەکەوێتە بەر مەترسی .**

پێشگیری لە گەلانی دیکە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەکەن .

" مێژووی رابردووی گەلانی رۆژهەڵات بەتایبەتی رێڕەوانی رێبازی محەممەد

(د.خ) بەئاشکرا شایەدی دەدا کە گەلانی زۆرلێکراوی موسڵمان بۆ گۆڕینی هەل و مەرجی داسەپاو وقەرەبووی دواکەوتوویی یەکان بە دڵ و گیان حەولیان داوەو دەرفەتیشیان بۆ هەڵکەوتووە. جاکەوابوو ئێستاش نەک دەتوانین شان بە شانی سەرقافڵەی ئیمڕۆی دونیای زانست وتێکنۆلۆژی بڕۆن بەڵکوو بەراستی دەتوانن هانادەر وپشتیوانی حەول و و دەولی هەمە لایەنە لە مەیدانی رقەبەری لەگەڵ پاوانخوازان بن و گۆ لە مەیدان بەرنە دەر."

هەروەک پێشان گوتمان زانست بەپێی کەرستەبوونی خۆی دەتوانێ ئامرازێکی بەهێز بێ و لە خزمەت خاوەنەکەی دابێ و ئەو باوەڕە پووچە کە دەڵێ ئێمە ناتوانین لەدیاردەکانی پێشکەوتی زانست و فەن بەهرەوەر بین. ئەوەکوڵەدار لە زەینی خەڵکیان ئاخنیوە هەرکەس بە چەکی ئاگاداری زانستی تەیار بێ کەرەسە وئامرازیشی دەبێ و بەدەستەلاتیش دەبێ. جا ئەگەر ئەم مرخ وئێستعدادەی کۆمەڵی ئێمە گەشە بکا و ڕێبازی راست بگرێتە بەر دەتوانێ بە هەموو هێزەوە وێرای بردنەسەری پلەی ژیانی خەڵک ، کۆتی سەر سپێراوی چەوساوەکان بە جیهانی ئیستکبار بۆ یەکجاری بنەبڕ دەکا .

**خوا یار بی**

**درێژەی هەیە**

**بسمه تعالی**

# سر مقاله

باسلام به خوانندگان عزیز

در شماره‌های گذشته درباره‌ء نقش علم وپیشرفتهای علمی در زندگی بشر ونیز رابطه‌ء بین ترقی درزمینه‌ها ـ ی صنعت وتکنولوژی وسلطه جهانخواران بحث شد وسخن بدینجا رسید که اکنون چه وظیفه‌ای برعهده‌ء ماست ؟ و درقبال بحرانی که هم اینک ازسوی سیاستگذاران شرق و غرب وبکمک دانش درجهان بشری پدید آمده چه تکلیفی داریم؟ بی شک دو وظیفه‌ء مهم بردوش ما سنگینی میکند که نخست آن مقابله‌ای جدی، اساسی و... جامع الاطراف با تهاجمات استکبار (بمنظور ممانعت ازتحکیم، تنفیذ و گسترش حوزه‌ء تسلط سیاستهای استعماری) است .بطورقطعی ویقینی میتوان گفت که اگر دراین جهت خود را مهیا ساخته واز خمود وغفلت وجمودو رخوت بیرون نیائیم نه تنها نخواهیم توانست یورش جهانخواران را دفع وحقوق، ازدست رفته‌ء ملتهای تحت ستم را بازستانیم، بلکه شرائط موجود نیز هرلحظه تغییر یافته وبروخامت اوضاع افزوده میگردد.

**" خاصیت زیاده طلبی که قرین ذاتی ستم وتجاوزاست موجب میگردد تا بطورپیوسته مرزهای حقیقی حقوق ملل نادیده انگاشته‌و موردتعدی قرار گیردوچنانچه‌راه‌تجاوز وانحصارطلبی مستکبرین سد نگردد، موجودیت مستقل تمامی ملتها بطور جدی تراز همیشه درمخاطره خواهدبود."**

ازآنجا که امروزشاهد انفعال غمناک بخش عظیمی از توده‌های مردم وخودفروشی حاکم ورهبران سیاسی وبعضا" مذهبی درکشورهای جهان سوم‌هستیم، درصورت ادامه‌ء این وضع، تصویر آینده‌ء زندگی بشر سلطه پذیر بسیار غمگینانه‌تر ازامروزخواهدبود. دراین میان پیروزی باملتهایی استکه با معرفت وشناخت شرائط وارتقاء سطح‌بینش سیاسی و.... وتکیه‌برمکتب احیاگر ورهائیبخش محمدی (ص)، بایکپارچگی و وحدت علمی، اعتماد به نفس ، ایمان به پیروزی نهائی وبا بهره‌گیری ازعناصراستقامت وپایداری به دعوت تسلیم

طلبانه فرعونیان زمان "نه" ای قاطع گفته ودر برابر قلدریهای آنان محکم ایستاده واز تهدیداتشان نهراسیده و عقب ننشینند.

**"همهٔ ملتها باید بدانند که رضایت به وضعیت موجود در حقیقت رضایت به نابودی است زیرا مطامع روبه تزاید استعمارگران که مبتنی برقانون جنگل واعتقاد "اَلْحَقُّ لِمَنْ غَلَبَ" است هرگز به وضعیت موجود راضی نخواهد بود."**

براین اساس مقاومت و ایستادگی ونبرد با مستعمرین وایادی آنها ازدوجهت امری ضروری وحیاتی است.یکی آنکه وضعیت آینده ازامروزوخیم تر نگردد ودیگراینکه حقوق از دست رفته باز ستانده وستمهای وارده جبران گردد. هیچ تردیدی نیست که درانجام این بخش ازوظایف خود وبدلیل تعیین کننده بودن نقش علم درساختار نظام سلطه وتاثیرش در "قدرقدرت" ساختن ستمگران ناچاریم این حربه را ازدست دشمنان دینی ودنیایی خود خارج ساخته وبا بهره گیری صحیح ازاین سلاح موثر، یوغ بردگی واطاعت ذلت بار را از گردن مردم مظلوم ومحروم ملتهای تحت ستم وعقب مانده برداریم. اینکه امروزه علم منحصرا "درخدمت شبکه های جهانی استعمار درآمده مربوط به ویژگی جوهری آن نیست بلکه برنامه ریزی وسیع و حسابشده نظام سلطه وعوامل مزدورآنها باعث شده تا ضمن کسب ترقی در علوم وصنایع ملل دیگر را از نیل به پیشرفت متناظر باز دارند.

همانطور که قبلا" یادآور شدیم علم بنا به خاصیت ابزاری خودمیتواند بعنوان وسیله‌ای نیرومند درخدمت اهداف صاحبان خود در آید واین تصور که مانمیتوانیم ازمظاهر پیشرفت در علوم

**خاصیت زیاده‌طلبی که قرین ذاتی ستم وتجاوز است موجب میگردد تا بطور پیوسته مرزهای حقیقی حقوق ملل نادیده انگاشته ومورد تعدی قرار گیرد و چنانچه راه تجاوز وانحصارطلبی مستکبرین سد نگردد، موجودیت مستقل تمامی ملتها بطور جدی تر از همیشه در مخاطره خواهد بود.**

**"تاریخ گذشتهٔ ملل شرقی وبویژه پیروان مکتب محمدی (ص) بروشنی گواهی میدهد که ملتهای تحت ستم مسلمان برای تغییر شرائط موجود و جبران عقب ماندگیها از توان روحی وجسمی لازم وکافی برخوردار بوده ونه تنها همطرازی با پیشگامان امروزدنیای علم وتکنولوژی برای آنان ممکن است بلکه بحقیقت میتوانندبا پشتکار و تلاش ومساعی همه جانبه در میدان رقابتی جدی با انحصارطلبان، گوی سبقت را ازآنان بربایند."**

وفنون بهره جوئیم وهمی بیش نیست که ازسوی استعمارگران دراذهان غافلین تزریق شده است. هرکس که مجهز به اطلاعات علمی گردد مجهز به اسباب وتجهیزات ودرنتیجه قدرت میشود. وچنانچه استعدا - دهای جامعهٔ ماشکوفا گشته ودرمسیر صحیح جهت یابد، میتواند باتوانمندی هرچه بیشتر، ضمن ارتقاء سطح زندگی مردم، قیدوابستگی مستضعفین به جهان استکباررا بطورکامل وبرای همیشه حذف نماید (انشاءا...).

ادامه دارد.

# بۆ؟ دایە...

برایەکی خۆشەویست بەناوی جەعفەری مەعرووفی ،بەسەرهاتێکی دڵتەزێنی گێڕاوەتەوە کە لەروانگەی بارهێنانی منداڵ را دنیایەکی پەند و مانا تێدایە وئێمەش بۆ خوێنەرانی بەڕێزبەتایبەتی ئەو دایک و بابانەی منداڵی وردیان هەیە لە "سروە"دا بڵاوی دەکەینەوە. هێندێک یا رەنگەزۆربەی دایک وباوکان لە وڵاتی ئێمەدا هەڵبەز هەڵبەز و شڵوقی و هەدانەدانی منداڵیان بەلاوە شتێکی خراپە و لایان وایە منداڵێکی سێ چوار ساڵەش وەک ژن یا پیاوێکی بەساڵداچوو دەبێ بێدەنگ ولەسەرەخۆ بێ.

کایەکردن لەپێگەیاندنی منداڵدا نەخشی کارای هەیە ئەورۆ لەدنیای پیشکەوتوودا پسپۆرانی فێر کردن و بارهێنان زۆر کەڵک لە یاری کردنی منداڵ وەردەگرن و کایە و یاری وەکوو باسێکی گرینگی بارهینان وەبەرچاو گیراوە

* * *

لە مانگی رەشەمەی ساڵی ٦٤ دا لە شارستانی ورمێ کابرایەک دووهەزار تمەن دەدا بەخێزانی و دەڵێ :

— ئەو پوولە بۆخەرجی ماڵ بابەلاتەوە بێ.

ژنەکە پووڵ وەردەگرێ و بەبێ موبالاتی لە گۆشەیەک لەبن دەستەنوێنی دەنێ. منداڵێکی سێ چوار ساڵەی دەبێ.رۆژێک تووشی پوولەکە دەبێ ودەیباتە سووچی حەسار ودەیسوتێنێ و یاری پێدەکا.

دایک لەو کاتەدا لە دەرەوە دێتەوە ماڵ و بۆ هەڵگرتنی هێندێک پوول دەچێتە لای دەستەنوێن و دەبینێ پوول نەماوە.دەست دەکا بە ئێروئەوی گەڕان و لەپڕ چاوی بەمنداڵەکەی دەکەوێ کەئاوری کردوتەوە. بەغاردان خۆی دەگەیەنێتە منداڵ ودەبینێ پوولەکەی سووتاندووە.دەیگری و زوری لێدەدا. بەوەش رازی نابێ و دەیباتەوە ژووری ماڵ و بە کەوچک پشتی هەردوک دەستی داغ دەکا. زریکەی دڵتەزێنی منداڵی چارەڕەش بەرز دەبێتەوە و بەهیچ کلۆجی ژێر نابێتەوە. پاش نیو سەعاتێک باوک دێتەوەو دەپرسی :

— چ خەبەرە ئەو منداڵە بۆ دەزریکێنێ ؟

ژنەکەی رووداوی لە نووکەوە بۆ دە گێڕێتەوە باوکی تووڕە منداڵەکەی بەپەلە دەباتە نەخۆشخانە لای دوکتۆر. پاش مانگ و نیوێک دەوادەرمان چارەسەری برینی دەستەچکۆڵەکانی منداڵ ناکەن وهەردوک دەستی لەجومگەڕا دەبڕنەوە و منداڵی بەستەزمان بە بێدەستی دەبەنەوە ماڵ.

رۆژێک لەکاتی نەهار خواردندا منداڵەکە روودە، باوکی دەکا ودەڵێ :

— ئەگەر قسەیەک بکەم ئەتۆش لێم نادەی. داغم ناکەی ؟".

باوکی بە دڵسووتانێکی زۆرەوە لە باوەشی دەکاو بەخۆیەوە دەکوشێ ودەڵێ:

— نا رۆڵە گیان نا داغت ناکەم. بڵێ .

منداڵەکە بەدەنگی ناسکی دەڵێ :

— بە دایکم بڵێ دەستەکانم داتەوە٬ باشە بابە گیان !

باوک بە بیستنی ئەو قسانە جێ بەجێ دڵی دەتۆقێ و سەکتە دەکا .دەمێنێتەوە دایکێکی نەزان ومنداڵێکی کەقوربانی نەزانی دایکی بووە بە داهاتوویەکی تاریک و نادیارەوە !"

مەزهەبی

خوای تەبارەک وتەعالا دەفەرموێ "واعبدوالله ولا تشركوبەشیئا "وبالوالدین احسانا " وبذی القربی والیتامی والمساكین والجار. ذی القربی والجارالجُنُب والصاحب بالجنب و ابن السبیل وما ملكت ایمانكم. ان اللەلایحب من كان مختالا" فخورا " سوورەی نساء ئایەی ٣٦

واتە: عیبادەتی خودا بکەن، بە یەکی بزانن شەریکی بۆدامەنێن، چاکە لەگەڵ دایک وباب بکەن، و لەگەڵ خزمان وهەتیوان داماوان، و لەگەڵ جیرانی خزم ونیزیک ،لەگەڵ دراوسێ دوور و بێگانە، لەگەڵ هاودەم وهاونشین وموسافیران و لەگەڵ ژێردەستان و خزمەتکاران(چاکە بکەن) و خودا ئینسانی خودپەسند و موتەکەبیری خۆش ناوێ .

جگە لەوەش تەواوی موسڵمانان بەهۆی ئیسلامەوە بوونەتە برا و حەقیان بە گەردنی یەکەوە هەیە ودەبێ ئەو شتانەی کە بۆ خۆیان ناوێ بۆموسلمانی دیکەشیان نەوێ( **لایومن احدكم‌حتی یحب لا خیەما یحب لنفسه**) و ئەو شتەی کە بۆخۆی پێخۆشە بۆبرای دینیشی پێخۆش بێ .

هەقێکی دیکەشی هەیە کە هەقی جیرانەتی یە، حەزرەتی رەسووڵ دروودی خودای لەسەر بێ فەرموویەتی :

جیران سێ بەشن : بەشێکیان یەک هەقیان هەیە بەشێک دوو هەق و بەشێک سێ هەق. ئەو بەشە کەسێ هەقی هەیە ،جیرانی موسڵمانی خزمە ،کە هەقی جیرانەتی وموسوڵمانەتی وخزمەیایەتی ئەو جیرانەی کەدوو حەقی هەیە، واتە جیرانی موسڵمان، یەک هەقی جیرانەتی یە و ئەوی تریش حەقی موسڵمانە- تی یە. و ئەو جیرانەی کە تەنیا هەقێکی هەیە جیرانێکە کە کافر بێت

هەقەکەشی هەقی جیرانەتی یە

لێرەدا پێویستە جوان بڕوانین کە هەر بەهۆی جیرانەتی هەقێک بۆ کافر دانراوە. جا ئەگەر کەسێک بیهەوێ موسڵمانێکی تەواو بێ لەسەری لازمە ئەو هەقانە لەبەرچاو بگرێ.

حەزرەتی فەخری کائینات (د.خ) فەرموویەتی:

حەزرەتی جبرەئیل ئەوەندەی لەبارەی هەقی جیرانی باش، لێ دووپات دەکردمەوە کە پێموابوو دەبێ دراوسێ لە دراوسێ میرات بگرێ.

لەخزمەت رەسووڵی خودا (د.خ) چاکەی ژنێکیان دەگێراوە وکوتیان بە رۆژ رۆژووی دەگرێ وبە شەویش نوێژان دەکا، بەلام جیرانان ئەزیەت دەکا. حەزرەت (د.خ) فەرمووی لێم روونە کە ئەو ژنە دەچێتە نێو ئاگری جهەننەم.

دوای ئەوەش پێویستە بڵێین کە مافی جیران تەنیا ئەوە نیە کەئازارت بۆی نەبێ. بەڵکوو دەبێ بەپێی توانا لە هەموو خۆشی وناخۆشیدا هاوبەشی بکەی ولەگەڵی سەبرت هەبێ کوتراوەکە لە قیامەتدا جیرانی فەقیر لە حزووری خودا لە جیرانی دەوڵەمەند سکالا دەکا ودەڵێ ئەو جیرانە هیچ ئاورێکی وەسەر من نەداوەتەوە .

ئیمامی غەزالی خودای لێ رازی بێ دەلێ بە (ابن المقفع)یان کوت جیرانەکەت لەبەر قەرزداری خانووەکەی دەفرۆشێ (ابن المقفع) کە جارویار لەبەر نیسێی خانووی ئەو جیرانە دادەنیشت .قەرزەکەی بۆ داوە و نەیهێشت خانووەکەی بفرۆشێ، دوای ئەوە کوتی ئەگەر وام نەکردبا هەقی جیرانەتی ودانیشتن لەبەر نیسێی ئەو خانووەم ئەدا نەدەکرد .

لەبارەی حەقی جیرانە ـ تیدا میسال زۆرن بەلام لێرەدا ناگونجێ ئیشارە بە هەموان بکەین. وەکوو کوتراوە (الجّار قبل الدار) واتە: جیرانی باش لەخانوو باشترە یا ئینسان بێ خانوو بێ باشترە لەوەی جیرانی خراپی هەبێ .

دیسان ریوایەت کراوە کە جارێک ئەسپێکی زۆر توندو چالاکیان هێنا لای حەزرەت (ص) ولێیان پرسی قوربان

ئەو ئەسپە بۆچی باشە ،،
فەرمووی ئەسپی وا توندرۆ
بۆیە باشە کە سواری بی
و لەبەر جیرانی خراپ
هەلێی . و..... بەکورتی
لەسەر هەموو موسوڵمانێک
لازمە بۆ بەجێ هێنانی
هەقی جیرانەتی ئەو خاڵانە
لەبەرچاو بگرێ :

ئینسان کە گەیشتە
جیران دەبێ سڵاوی لێ بکا
زۆری لەگەڵ نەلێ،نەوەکوو
نارەحەت بێ،زۆری پرسیار
لێ نەکا مەبادا دڵرەنج
بێ. ئەگەر نەخۆش کەوت
بچێ عەیادەتی بکا ،ئەگەر
تووشی بەلایەک بوو هاودەردی
و یارمەتی بدا و لە
نارەحەتیدا بەشداری بکا و
ئەگەر خوای مەزن نیعمەتێکی
پێ بەخشی وخۆشحاڵ بوو
پیرۆزبایی لێ بکا .

ئەگەر سووچ وتاوانێکی
لێدی چاوپۆشی بکا ، بۆ
ئەوە راز ونهێنی جیرانی
نەبینێ نەچێتە سەربان،
رێگەی دەرچوونی ئاوەڕۆی
سەربان وحەوشی لێ نەبەستێ
زبڵ و زاڵ نەهاوێتە بەر
دەرکێ، رێگەی هات وچۆی
لێ تەنگ نەکا ئەگەرشتێکی
بردەوە ماڵێ نابێ چاوی
لێ بکا ، ئەگەر میوە یا
خواردەمەنی یەکی بردەوە
ماڵێ یا بۆیان بنێرێ یا
پێشانیان نەدا ، ئەگەر
جیرانەکەی بە سەفەر چوو
چاوەدێری ماڵەکەی بکا ،بە
چاوی سووک وخراپ نەڕوانێتە
ژن ومنداڵی و خەڵکی
دیکەش نەهێڵێ تەماح لە
ماڵ و نامووسی بکا ،
دەبێ منداڵی جیرانی بۆ
رێگەی باشی دین ودونیا
رێنموونی بکا .ئەگەر جیرانی
دەستکورت داوای قەرزی
لێکرد دەستی بگرێ، ئەگەر
مرد لەگەڵ تەرمەکەی بچێتە
سەر قەبران ولە سەرەخۆشیدا
بەشداری بکا .

گوتوویانە ئەگەر جیران
لە جیرانی رازی بێ خواش
لێی رازی دەبێ .

بەیهەقی دەڵێ پیاوێک هاتە
خزمەت حەزرەتی رەسوول (د.خ)
و عەرزی کرد شارەزام بکە
لەسەر کارێک کە ئەگەر
ئەوکارەم کرد بە چاکم
بزانن و پێی بچمە بەهەشت
حەزرەت فەرمووی برۆ
چاکە بکە. پیاوەکە دیسان
پرسی چۆن بزانم چاکم یا
خراپ .حەزرەت (د.خ)فەرمووی
ئەگەر خەڵک کوتیان باشی

ئەوە باشی وئەگەر کوتیان باش نی، ئەوە باش نی و خراپی.

ئینسان دەبێ بەدەست وبە زمان وبە دڵ لەگەل جیران ئەمین بێ ، شک و گومانی خراپ لەبارەیدا نەکا .

دە شت هەن کە ئەگەر کەسێک ئەوانە تەرک بکا زولمە :

١- پیاو یا ژنێک کە تەنیا بۆخۆی بپارێتەوە و بۆ دایک و باب و موسلمانی تر نەپارێتەوە .

٢- کەسێک قورئان بخوێنی بەلام هەموو رۆژێ سەد ئایەت نەخوێنێ .

٣- ئینسانێک بچێتە مزگەوت وبە بێ ئەوەی دوو رەکات نوێژ بخوێنێ وەدەرکەوێ.

٤- کەسێک بەلای قەبرستان دا بڕوا وفاتیحەیان بۆ نەخوێنێ ودوعای بەخێریان بۆ نەکا .

٥- کەسێک لە رۆژی، جومعەدا بچێتە جێگایەک نوێژی جومعەی لێ دەکرێ بەلام ئەو نوێژە جومعەکەی تەرک بکا .

٦- ئەگەر زانایەکی باتەقوا لە ناوچەدا هەبێ و بۆ فێربوونی زانست و رێ وشوێنی دینی نەچنە لای .

٧- دوو کەس ببنە رەفیق وهاورێ بەلام ناو نیشانی یەکتر نەپرسن .

٨- کەسێک بانگ هێشتن بکرێ و بە بێ عوزری شەرعی بەشداری میهمانی نەکا .

٩- لاوێک کە ژیانی لاوەتی بەفیرۆ رادەبرێ و بۆ فێربوونی زانست و تیکنیک وهونەر تێناکۆشێ.

١٠- کەسێک جیرانەکەی برسی و نەدار بێ وخۆی دەست رۆیشتوو ، بەلام ئاوڕی وەسەر جیرانەکەی نەدا .

هەروەکوو لەپێشدا کوتمان هەقی جیرانەتی بایەخێکی زۆری پێ دراوە. و ئێمەش لەخودای تەبارەک و تەعالا دەپاڕێینەوە بۆ بەجێ هێنانی ئەو کارە گرینگە وخۆ پاراستن لەو خیسلەتە یاریمان بدا تا دلمان لەحاست جیرانان پاک وخاوێن ببێتەوە .

ئەحمەدی شەریفی لەفارسی یەوە کردویە

لە ئەدەبی کورددا ، سێ قۆناخی جیا لەیەک دێتە بەرچاو، هەریەک لەم قۆناخانە، لە دەورەیەکی تایبەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی جیادا هاتوونە مەیدانەوە و گەشەیان کردووە وپەرەیان گرتووە ، بێ گومان ئەدەبیاتیش هەروەک هەموو رووداوێکی دیکەی کۆمەڵایەتی هۆیەکی تایبەتی بۆهۆی سەرەتایی و تەنانەت بۆ هۆگەلی دوایش تێدایە. ئێمە ناچارین لە شی کردنەوە وتۆژینەوە* وبەررەسی هونەرو ئەدەبیاتی گەلدا ، لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی ئەو گەلەش بخەینە بەرچاو. لێرەدا بەتایبەتی دەبێ ئاشیرە* بۆ بارودۆخی ئابووری بکەین کە لە ژیان و بێچمی گەلان ونەتەوەکاندا ئەرکێکی گرینگ وسەرەکی، لەسەرشانە و بۆچوون و بیروباوەڕەکان قەوارەبەندی دەکا .

ناکرێ بەهیچ کلۆجێ* ئەم هۆگرینگەی ژیانی کۆمەڵگا بە شتێکی کەمبایەخ لە قەڵەم دەین و بیخەینە پشت گوێ .

لە دەورانی دەرەبەگایەتی پێ* چڕو سەخت گیانی کورددا ، دوو قۆناخی«بدایەت ونەهایەت» دێتە بەرچاو کە لەباری ئابووریسەقامگیرە* و کامیلەن لێک جیاوازن و تۆفیریان هەیە، قۆناخی سەرەتایی ئەم دەرەبەگایەتی یە کە هەر بە هیندێک گۆڕانەوە، بۆ ئاشانکاری وتە دەکرێ ناوی دەرەبەگایەتی لەسەر دانێین لە روانگەی ئابووری یەوە تێکەڵاوی بەکە لە باری ئابووری مەزن و ئابووری شوانی و ئاژەڵداری .

لەم قۆناخەدا کەرەسەی بەدی هێنەر ئاژەڵ و ئاژەڵداری یە، هۆزو خێڵەکانی کورد، لە جووڵە و گەڕانێکی بێ وچان ودائیمی دان، بۆ دۆزینەوەی لەوەڕگەی باش و بژیو بۆ مەڕوماڵات و ئاژەڵیان. ئەم دەورەیە بەهۆی سروشتێکی تایبەتی کە هەیەتی کۆمەڵ نیشتەجێ نابێ و سەقامگیری بۆ نیە، هەر بەم هۆیەوە بارودۆخێک بۆ پێک هاتنی ئەدەبی رەسمی و نووسراوە نارەخسێ* و هەڵناکەوێ، هەر بەم هۆ تایبەتی یەی ئەم دەورەوەیە کە دەرفەت بۆ ئەدەبی گەلی و مەنزووم و هەڵبەستراوی لەزاران خۆش پێک دی. ئەم شێوە ئەدەبە دەتوانێ لەگەڵ خێڵاتی گەڕۆک*دا بێت وبچێ ، لە سینگاندا بمێنێتەوە، لەبەر کرێ و تێکەڵ کۆمەڵگای خێڵەکی بێ .

ئەم چەشنە ئەدەبە لەم قۆناخە تایبەتی یەدا ، لەگەڵ کاغەزو نووسراوە بێگانەیە و بەدەگمەنیش نانووسرێتەوە . بەڵام لەبەر دەکرێ، سینگاوسینگ دەگەڕێ و دەپارێزرێ .

ئەڵبەتە ، دەبێ ئەوەش بگوترێ مێژووی هونەری شیعر زۆر و کەم،لەناو تەواوی گەلانی رۆژهەڵاتدا ، ڕچەبڕتروکۆنتر لە پەخشانە، تەنانەت ئەگەر سەرنج بدەینە دەورانی سەرەتایی ژیانی مرۆڤ و پەیدابوونی هونەر لە کۆمەڵگای ئینسانی پێشوو و سەرەتایی وخولقانی هونەری جادوویی، دیسان دەبینین کە شیعر و وتە و قسەی ئاهەنگدار لە پەخشان

لەپێشترە، لەپێشدا شیعر بەدی هاتووە و
پاشان دەرفەت بۆ پەخشان رەخساوە. بەپێی
راهات* ، لە هەر دەورەیەکدا، هاوشانی
ئەدەبیاتی رەسمی و نووسراوە، ئەدەبیاتێکی
دیکەش بووە کە پێیان گوتووە ئەدەبیاتی
کۆمەڵ، ئەدەبی خەڵک وگەل، ئەم دوو،
شێوە ئەدەبی یە هاوشان و لە یەک
دەورەدا شوێن دەخەنە سەریەک بەڵام بە
دەگمەن هەڵدەکەوێ کە پێک بگەن و
یەکیەتی پەیدا بکەن وببنە یەک .

ئەدەبی رەسمی و نووسراوە سەرنج
دەداتە باری رازانەوەی وشە، ئاهەنگی
وشەکان و تەرکیباتی بەدیعی، لەم
رووە لە خەڵک دوور دەکەوێتەوە، لە
حەد و ئەندازەی تێگەیشتن وفامی کۆمە-
لانی هەراوی خەڵک مەودا دەگرێ و دوور
دەبێتەوە.

بەڵام ئەدەبیاتێک کە لەناو جەرگەی
کۆمەڵانی خەڵکدا لەدایک دەبێ لەگەڵ
ئەوان دەژی ودەبێتە ئاوێنەی بالانوێنی
شادی وخۆشی، تاڵ وسوێری کۆمەڵانی
خەڵک . وا لەگەڵ ژیانی خەڵک وکۆمەڵ
ئاوێتە دەبێ کە رووکاری رواڵەتی
دەگۆڕێ و هەتا رادەیەکی زۆر دەیانخاتە
ژێر پەردە وچاوپۆشی یان لێدەکا. لەم
قۆناخ و بارودۆخەدا، وێژەر خۆ بە
قافیەوە خەریک ناکا وبە قەولی مەولانا
موفتەعیلون موفتەعیلون بۆ شاعیر و
هۆزانڤانێکی کە کاری زۆر و دژوار و
سەختی هەیە شتێکی زیادی یەو وەخۆکوشتن
دەچێ.

ئێستا دەگەرێینەوە سەر باسەکەی
سەرەکیمان و سێ قۆناخی جیا جیای
ئەدەبی کوردی دەخەینە بەرباس .

لەقۆناخی ئەوەڵدا، شێوەی بەیت
بەوجوود دێ. ئابووری زاڵ بەسەرکۆمەڵدا
ئابووری ئاژەڵداری یە.

قۆناخی دووهەم کە لەودا شێوەی
"عرووزی" دێتە مەیدانەوە و گەشە
دەستێنێ ئابووری زاڵ بەسەر کۆمەڵگادا
ئابووری یەکە کە پێوەندی بە زەوی و
وەرزێرەوە هەیە. کەرەسەی بەدی هێنەر
دەگۆڕێ، ئاژەڵداری دەبێتە قۆناخی زەوی
داری "فیزیۆکراسی"* کە ئەم قۆناخە بە
دەورەی نەهایی دەرەبەگایەتی کورد
دادەندرێ.

قۆناخی سێهەمی ئەدەبیاتی کوردکاتێک
دێتە مەیدانەوە کە سەردەم و سەدەی
سەیری ئێستا دەست پێدەکا، لەم قۆناخەدا
تەژدیدی نەزەر لەنێوەرۆکی ئەدەبدادەکرێ
کە ئەویش بەهۆی نیازمەندی وپێداویستی-
یەکانی کۆمەڵە، شیعری نوێی کوردی بە
شێوەی ئێستا و نێوەرۆکی پێویستی
چاخیەوە لە لایەن شاعیری مەزنی کورد
گۆرانەوە دێتە کایەوە .

با ئەوەش بڵێین کە پێش گۆڕانیش شێخ
نووری شێخ ،ساڵە، بەهۆی ئاڵ وگۆڕێکی
کە لە ئەدەبیاتی تورکیەدا بەدی هاتبوو
دەستی دایە شۆڕشی نوێی ئەدەبی کوردی
و تێکۆشا بڵێسەی ئەم نەوخوازی یە لە
سولەیمانی یەدا بەدی بێنێ بەڵام لەم
رێگایەدا دڵخوازانە سەرنەکەوت ونەخشی
گۆران و شاعیرانی پەیڕەوی رێبازی
گۆران لەم ئاڵ وگۆڕەدا زۆرتر دێتە
بەرچاو وگۆران بۆتە ئاڵاهەڵگری پێشەنگی
قۆناخی نوێی شیعری کوردی. لێرەدا
دەبێ بیخەینە بەرچاو، کە شێوەی شیعری
نوێ لە ئەدەبیاتی کوردیدا لەگەڵ شێوەی
نوێی شیعر لە ئەدەبیاتی فارسیدا
جیاوازی یەکی زۆریان هەیە، لەئەدەبیاتی
فارسیدا چەشنە رەچەشکێنی و سوننەت
شکێنی یەککراو شێوەی شیعری کۆنی فارسی
کە هەزار ساڵی پێشینە هەیە گۆڕا.
شێوەی شیعری کۆن و کلاسیکی فارسی کە

له لایەن شاعیرانی مەزنی وەک فیردەوسی سەعدی، حافز، ومەولاناوە بە پلکــە و ئەوجی بەرزی خۆی گەیبوو هەڵوەشایەوە و شێوەی نوێی بەخۆیەوە گرت لە کاتێکدا شێوەی شیعری نوێی کوردی هەر لەباری نێوەرۆکەوە ئاڵوگۆڕی بەسەر هات و هاو دەنگ بوو لەگەڵ نیاز وپێداویستی یەکانی کۆمەڵ، لە قۆناخێکی تایبەتی و دیاردا بەڵام لەباری قالبەوە گەڕایەوە سەر شێوەی بەیت یا بەوتەیەکی باشتر بڵێین گەڕاوە سەر شێوەی کلاسیکی شیعری کوردی کە شێوەی بەیت بێ .

کورتی ودرێژی میسرەع تێکدانی نەزم و تابۆرەی* عەرووزی، گۆڕانی هێنانی حەتمی دوو مەسرەع پێکەوە لە شیعردا، لەشێوەی شیعری نوێی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەرباری کلاسیکی شیعری کوردی، کە شێوەی بەیتی یە و لە بەیتەکانی کوردیدا بەدی دەکرێ.

هیوایە دەرفەتمان بۆ هەڵکەوێ هەتا لە سەرشێوە و ڕێبازی شیعری نوێی کوردی لە داهاتوودا پتر بدوێین چونکەمەبەستی ئێمە لێرەدا هەر تەنیا ڕۆیشتن ود وان لەسەر شێوەی بەیتە، پاش ئەم ڕەدە — بەندی یەی کە لەسەر قۆناخی ئەدەبی کوردیمان کرد، ئێستا دەگەڕێینەوە سەر شێوەی بەیت .

شێوەی بەیتی شیعر، بەهەڵە خراوەتە پاڵ فۆلکلۆرەوە، ئەم هەڵەیەش هەم نووسەرانی عێراقی وهەم ئاکادێمیسیەنەکانی سۆڤیەت تووشی بوون و دووپاتە و چەند پاتەیان کردۆتەوە، لە حاڵێکدا بەیت تەواوی تایبەتی یەکانی شێوەیەکی سەربە خۆی شیعری هەیە، شێوەیەکی تایبەتی کە پێوەندی بەچاخ و زەمانێکی دیار و دەورێکی تایبەتی ئابووری وکۆمەڵایەتی — یەوە هەیە و شاعیرانی ئەم چاخ و دەورەش ناودار و ناسراون .

بەڵام بۆ بەم شێوەیە دەڵێین بەشێکە لە فەرهەنگی گەلی و فۆلکلۆر؟ بۆلەکاتێکدا ئەم شێوەیە باو بووە، بەتایبەتی لە قۆناخی سەرەتایی دەرەبەگایەتی کورد، واتە قۆناخێک کە کۆمەڵ بەئاژەڵداری یەوە دەژی، هاوشانی ئەدەبی ڕەسمی ڕێ دەپێوێ؟ بەڵام لەم قۆناخەوە هەر ئەدەبی گەلی و فۆلکلۆری شوێنەواری هەیە و باس لە ئەدەبی ڕەسمی و نووسراوە نیە، یا واباشە بڵێین بۆچی لەو قۆناخانەدا دوو بەشی ئەدەبیاتی ڕەسمی وگەلی پێکەوە هاوهەنگاو ڕێباز دەبڕن وتەنانەت شوێن دەخەنە سەریەک وبەرەوپێش دەچن و لە سەردەمی ئاژەڵداریدا ئەم دووشێوە هەتا ڕادەیەک یەک دەگرن و لە قەوارەی بەیتدا خۆ دەنوێنن یانی لەوسەردەمەدا شێوەی بەیت هەم فەرهەنگی گەلی و فۆلکلۆرە و هەم فەرهەنگی ڕەسمی یە .

بەڵام پاشان لەقۆناخی پێشکەوتەدا دیسان ئەم دوو شێوەیە لێک هەڵدەبڕێن؟ لەوان بابەتانەوە وەڵامی پرسیار ئەوەیە کە بەهۆی لەنێوچوونی وێژەرانی بەیت و نەبوونی ئەدەبی نووسراوە و پەخشان و چاپ نەکرانی دیوانەکان ناوی زۆربەی وێژەرەکان فەراموش کراوە، ئەم کارە بۆتە هۆی ئەوەی کە بەیتەکان بەناوی فەرهەنگی گەل وفۆلکلۆرەوە لە قەڵەم درێن و وەک شوێنەوارێکی ڕەسمی ودیاری کراو نەناسرێن، دووهەم، بەهۆی ئەوە کە بەیتەکان نەنووسراونەوە کەوتوونە گێژاوی گۆڕانی چەندوچۆنەوە و لە هەر ناوچەیەکدا بەزاراوەی تایبەتی ئەو ناوچەیە باو بوون وبە ئیلهام لە تایبەتی یەکانی هەرێمەکە گۆڕانیان بە سەردا هاتووە ئەم گۆڕانە هەتارادەیەکە کە زۆرجار ناسینەوەی دەقێکی بەیتی

ناوچەیەک لەگەڵ هەمان دەقی ناوچەیەکی دیکە دژوارە، بۆ وێنە بەیتی مەم و زینی عێراق لەگەڵ مەمی ئالانی ئێران و مەموزینێکی شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی ژێرسازی کردۆتەوەجیاوازی یەکی زۆریان هەیە، هەم لە کاکڵە ونێوەڕۆکدا و هەم لەناوی جێگاکان و مەڵبەندی ڕوودانی داستانەکەدا، ئۆسکارمان کورد ناسی بەناوبانگی ئەڵمان کە لە زەمانی موزەففەرەدین شادا هاتۆتە ئێران و نزیکەی ١٧ بەیتی کوردی کۆکردۆتەوە و چاپی کردوون، کەسێکی کە ئەم بەیتانەی بۆ ئۆسکارمان کوتووە ناوی ڕەحمان بەکر بووە. ڕەحمان بەکر لە بەیتی دمدمدا شاعەبباسی سەفەوی لەگەڵ فەتعەلیشای قاجار لێ گۆڕاوە، ئەم چەشنە هەڵەو تۆفیرانە بەڵگەیەکی دیکەیە بۆوەی کە تۆژکاران بێنە سەر ئەم باوەڕە، کە بەیت هونەرێکی فۆلکلۆری یە وفڕی بە قۆناخ و ڕێبازێکی تایبەتی شیعری یەوە نیە .هەروا هیندێک هۆی دیکەش هەن وەک کەوتنە سەر زاری هیندێک بڕگەی بەیتەکان، ڕەوانی نزیکێکی کە بەهۆی ئاڵ وگۆڕەوە بەسەر بەیتەکاندا هاتووە، ولەزمانی کۆمەڵانی خەڵک نزیک بوونەوە،ئەوانەش دیسان هۆگەلێکی دیکە بوون بۆوەی کە بەیت بە فەرهەنگی گەلی وفۆلکلۆر دانێن ولە فەرهەنگی ڕەسمی ودیوانی جیا کەنەوە ئەمە ئاکادێمیسیەنەکان و تویژکارانی کورد ناسی خستۆتە هەڵەوە کە بەیت بە فۆلکلۆر بزانن و لە فەرهەنگی ڕەسمی هەڵاوێرن .

پرسیاری دووهەم هاتۆتە گۆڕێ، کە بۆچی لەقۆناخی ئەوەڵدا کە قۆناخی ئاژەڵداری دەرەبەگایەتی کوردە بەیت وەبرەو دەکەوێ ولەم قۆناخەدا سەر و کارمان کەمتر لەگەڵ دوو جەرەیانی ئەدەبی ڕەسمی وگەلی یە و شێوەی بەیت دەبێتە سوارچاکی مەیدانی شیعروهونەری کوردی ؟

لەم بارەوە دەبێ بڵێین لەوقۆناخەدا کۆمەڵگا تووشی دژواری ئەوتۆی کۆمەڵایە ـ تی وچینایەتی وئابووری نیە، ڕەگەی خزمایەتی لەناو خێڵ وکۆمەڵگادا زۆر، قەوی وبەهێزە، بەراستی خێڵێک وەک بنەماڵەیەکی زۆرگەورە وبەربڵاو دەچوو کە لەباری ئابووری وکۆمەڵایەتی بەوە چارەنووسێکی یەکسانی هەیە.

لەم قۆناخەدا خێڵ و کۆمەڵگا چارەنووسی پێکەوە لکاوە ، ئابووری ، پێکەوە لکاوە، شادی وخۆشی پێکەوە لکاوە وچین وتوێژی خێڵ پێکەوە بەستراون هەر بەمهۆیەوە فەرهەنگ وئەدەبێک بێجگە بەیت بەوجوود نایە، تەنانەت ئەگەر مەیدانیشی بۆخۆش کرێ، دەبێتە شتێکی زیادی و گەشە ناکا . بەیتەکانی کوردی بارودۆخی جۆربەجۆری ژیانی مرۆڤی کورد دەگرنەوە وەک حەماسەیی ورەزمی وعیشقی وئەوینداری ، ئایینی ومەزهەبی وستایشی سروشت ... کە جەوهەر و ئەسالەتێکی سەیریان تێدا بەدی دەکرێ .

بەیت وێژان لە رامان و خولقانی بارودۆخێکی کە پێوەندی بە فەرهەنگ و ژیانی سەردەمی کۆمەڵگای ئاژەڵداری یەوە نەبێ تووشی هەڵە وسەهوان دەبن، ئەم چەشنە هەڵە و سەهوانەش بە هاسانی دەدوزرێنەوە و زەق دێنە بەرچاوان،بەڵام لەبارگەلی دیکەوە، کە پێوەندی یان بە کۆمەڵگا وفەرهەنگی قۆناخی ئاژەڵداری یەوە هەیە فەڕ و شکۆیەکی تایبەتی و سەیر دەخولقێنن کە نموونەی گرینگی ئەم فەڕ وشکۆ سەیرە لە بەیتی سەیدەواندا دێتە بەرچاو، هیوامە لەداهاتوودا لەم بابەتەوە پتر بدوێم.

## رەنگین هیرانی

شاعیری کورد مستەفا کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەلی کوڕی شێخ مستەفا کوڕی شێخ عەبدوڵلا کوڕی شێخ سولەیمان نازناوی "سافی هیرانی"یە

ساڵی ١٨٧٦ م لەگوندی هیران هاتۆتە دونیا. هیران ونازەنین دووگوندی ناوچەی خۆشناوەتی کوردستانی عێراقن. ئەودووگوندە، بەتایبەتی هیران وەکوو بەهەشتی سەرزەوی یە. سافی پێش مردنی باوکی لەنێو فەقێ یان خەریکی خوێندن بووە، ئەوحەموو لایەکانی ناوچەی خۆشناوگەڕاوە، پاشان چۆتەوە هەولێروکۆ و پلەیەکی بەرزی علوومی عەرەبی ودینی وەرگرتو ـ وە، پیاوچاکی وشێخایەتی ئەوان بۆخەڵک جێگای شک ودوودڵی نەبوو، فەقیر دۆستی دڵپاکی ببوو بەهۆی ئەوە خەڵکی ناوچەی خۆشناوبە" کاکی هیران" ناوی بەرن.

سافی تاکۆچی دوایی باوکی زۆر شۆخ وشەنگ و بێ پەروا بوو، لەم سەردەمەدا دەمی بە کەمەندی شیعری ئەوینی چاوکاڵان لەئاسۆی ڕەشماڵان، گوڵ وگوڵزاری کوێستان، ئاسک وکارما مزدەپشکووت، سی ساڵی بەمجۆرە رابوارد بەڵام مردنی باوکی نەیهێشت زۆرتر درێژە بەسەر بەخۆیی وبێ لایەنی بداو بووبە جێ نشینی باوکی سافی رێ ڕەوی تەریقەتی قادری بوو کە لەنێو دڵی دەروێشان جێگای کردەوە.

**سافی** یە**کە**م جار زۆربەی شیعرەکانی سەبارەت بەئەوین وخۆشەویستی دڵدارەکەی بوو. بەڵام دوایە شیعرەکانی بووبە تەسەووف. بەوەش دڵی ئۆقرەی نەگرت وبوو بەئەویندار ی فەخری کائنات حەزرەتی رەسووڵ " د ـ خ".

عیشقی مەجازی:

**بازی دووری وا بەتیری غەمدڵی کردمنەزار**

قەت موعینێکم نەبوو عەرزم بباتە گۆیی یار

ئەم حەوت پارچە شیعرە لە دەوری فەنا فی تەریقە دایە .

یاران کوژراوی نازم سەبرم لە دڵ نەماوە
عاشق بە چاوی بازم کەی رووم ئەکا بەلاوە ،

ئاخرەکەی دەڵێ:

سافی لەبەر دەرگا نەت کەوتە سەر خاکی زیللەت
چاوەڕێی لوتفی تۆیە جانا لە ڕێی بەغداوە

لە دەورێ کە ئەویندارێ پێغەمبەر(د-خ) دەڵێ:

قەدی شەنگ وشۆخ ئەگەر بێ سەروی بوستانی تووە
باخی سێوو خۆخ ئەگەر بێ ئەوگوڵستانی تووە
واکە مەولا وەسفی تۆی کردوا بەلەولاڕووحەکەم
عالەم وئادەم چیا رایی سەنا خوانی تووە
سیڕڕی "سبحان الذی اسری"نیشانەی شاهیەت
تووڕڕەیی خەتمی ریسالەت مۆری فەرمانی تووە

لە ئاخری دا دەڵێ:

سافی بێ سەرمایەیی تەقوا لە کونجی موفلیسی
چاوەنۆڕی گەنجی لوتف ونەقدی ئیحسانی تووە

لە دەوری عشقی خوا بە فارسی دەڵێ:

من دردو جهان غیر خدا یار ندارم
جز یاد خدا هیچ دگر کار ندارم

سافی بەچوار زمانی کوردی ، فارسی ،ترکی وعەرەبی شیعری داناوە هەروەکوو دەڵێ:

ئەی بای سەبا هەستە لە عالەم بەوە هوشیار
شەرحی دڵە ماتەمزەدەکەی من بەرە بۆیار
لەوفیرقەتی ئەووا رەمەقێ ماوە لە عومرم
ئومێدی حەیاتم نیە رووحم نەبێ غەمخوار
ئاجیلغە دوشدی شوغریب گوگلەمی هەیهات
وەسلین لە نەجات بولمەسەبی چارەکیمی وار
کیمسە سورە مەزعیللەتی عشاقنە هەرگیز
تیمارە سنین بەشقەیی یوق زومرەی بیمار
لا اَمتَنِعُ عَنْ قُربِکَ مِنْ لَوْمِ مُلائم
اَنْ اُصْبِرُ فی بُعْدِکَ قَدْ اَحْرِقُ بِالنّار
لو جسمی بُعیدلکَ فالروحُ قریبٌ
اِنْ تَرْحَم بالروح اِنْ تَقْتُل فاختار
من مستم از آن باده صهبای تو لیکن
این سربی تو درجلوه‌گه عیشق توهشیار
کاشانەی لاهوت بود لایق آنکس
مال وسروجانش کە نهادی بەرەیار
خۆی کوردی یە"سافی" لەهەوای عیشقی تو ئێستێ
کوردی،عەرەبی،فارسی وتورکی بووە ئەشعار

شاعیری کورد جەببار ئاغای "کانی" خەڵکی هەولێر لە یەکێک لە شیعرەکانی مەدحی سافی دەکا ودەڵێ:

ئوستادی غەزەل سافی یە جێگەی لە هیرانە
باسی چ دەکەی زاهیر مەشهووری جەهانە
مەقسەد لە مەهەرمو خلیسەدا ئیمی بزانە
بۆچاک وخەراپ تالیبی فەرمانە هەناوم.

سافی زۆری کەیف بە مرۆڤی کورد دۆست وکوردپەروەر دەهات ، پشت وپەنای کوردستان بوو ،رژیمی عێراق ونۆکەرانی ئینگلیس زۆریا - ن راونا بەلام لە سەر ڕێگا وشوێنی ئەو بنەماڵەکەشی تا ئێستا سەریان لەبەرامبەر دوژمن شۆڕ نەکرد ۆتەوە ولە هەموو کات پارێزگاری لە فەقیر وهەژاران دەکەن.

سافی زۆری حەز لەڕاوەکەو دەکرد وزۆربەی کاتی خۆی بەڕاو رادەبوارد بەلام گۆشتی کەوی نەدەخوارد جا هەربەم بۆنەوە لە شیعرێکدا دەڵێ:

یاری خۆم لێ زیزە بۆیە حەزلە مەرگی نەوەدەکەم
شەوکە بێ هۆشم لە تاوی ،وا مەزانە خەو دەکەم
بۆشکاری مورغی وەحشی نەهەڵۆو شاهێنم
عەشقی چاوی بازی خۆمە بۆیە ڕاوی کەو دەکەم

سافی حەوت کوڕی هەبوو ،

سافی هەمیشە کەیفی بە دەنگی خۆش وناسک هاتووە بۆیە گۆیندەی تایبەتی خۆی هەبووە کە شیعرەکانی بە گۆرانی بۆ گوتووە وئەویش خۆی بۆڕا ژاندوە فرمێسکی دابارا ندووە ..

سافی ساڵی ١٩٤١ م لە گوندی هیران ، کۆچی دوایی کردووە ولە ئەشکەوتی باب وباپیرا - نی " لە تە نیشت وان ناژراوە خوا لێی خۆشبێ و ڕەوانی بە جەننەت شاد بێ .

# زێدی من: شێخان

حاسل قادری

دێی **شێخان** یەکێکە لە دێیەکانی ناوچەی شنۆ و ١٠ کیلومێتر لە شار دوورە ، شێخان کەوتۆتە سەر ڕێگای **پیرانشار- شنۆ.** لە جادەی ئەسلی یەوە چوار کیلومێتر ڕێگای خاکی یە. ڕێگای کویستانەکانی **کێلەشین** بەوێدایە.

شێخان لە ڕۆژئاواوە لەگەڵ دێی **کانی ڕەش،دڕوو و هێ** ولە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ئاوایی **کانی کیسەڵ بێتریان وتاژاندەرێ** دراوسێ یە. بەپێی سەرژمێری نوێ ئەم دێیە ٨٢ ماڵ و ٦٧٢ کەسە.

دێی شێخان، کەوتۆتە داوێنی کێوەکانی **ئاوەهەڵدێر سپی ڕێز وکێلەشین.** ئەو کێوانە سەرچاوەی هێندێک کانین کە ئاوەکانیان بە دەوروبەری دێیەکاندا دێنە خوار .وتێکەڵ چۆمێکی گەورە بەنێوی **چەمی سپی** دەبن . چەمی سپی لەبن کێوێک بە نێوی **کێوی سپی** دێتەدەرکە پێی دەڵێن کانی جنند.

جووتێری دێی شێخان زەوی وزار بەئاوی چەمی سپی دەدێرن .

خەڵکی شێخان لە ئاوی لوولەکێشی کە هەر لە کانی یەکانی دەوروبەرەوە کێشراوە کەڵک وەردەگرن .

زەوی وزاری ئەم دێیە **ئاویژە* ودێمەیە** ،کشت وکاڵی بریتین لە : **گەنم ،جۆ ، نۆک، باقلە ، تووتن،سێوک*،باینجان پیواز** و...

شێخان لەچاو دێیەکانی دراوسێ دار و باخاتی زۆرترە و بەهاران بەگیاو گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەرازێتەوە میوەکانی دێی شێخان بریتین لە : **قەیسی، خۆخ، سێو ، هەرمێ، ترێ، کرۆسک*، گێوژ**

شیلان و....

باغی شێخان بەرلە میوە ئەو قازانجەشی هەیە کە وەختی کاروکاسبی خەڵک بۆ پشوودان و حەسانەوە

لەبن سێبەریان دەحەسێنەوە

زۆربەی خەڵکی شێخان چادرچین وگەرمێن وکوێستان دەکەن .

کارەی مەڕ، دەنگی شمشاڵی شوان و هاژەی چەمەکان جوانی یەکی تایبە- تی خەڵاتی ناوچە کردووە. زمانی بەشی زۆری خەڵکی ئەو دێیە سۆرانی یە و بەشێکی هەرکین. خەڵکی شێخان موسوڵمانن و مزگەوتێکیان بۆ خۆیان چا کردووە. ماوەیەک لەوەپێش مزگەوتێکی کۆنی هەبوو کە پیرەپیاوان دەڵێن کەبناخە دانەری ئەم مزگەوتە **عەبدوڵڵای کوڕی عومەری** **خەتتاب**[٤] بووە. حەوزێکی زۆر پاک وخاوێنی هەیە کەخەڵک بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن کەڵکی لێ وەردەگرن.

شێخان کتێبخانەی نیە **بەلام لەکۆنەوە مەلاو فەقێی زۆر بووە** و زۆر مەلاش لەو

دێیە پێگەیشتوون.قوتابخا- نەیەکی سەرەتایی هەیە بەلام بەداخەوە هێشتا راهنمایی بۆ دانەندراوە. بەو هۆیە ناوی شێخانیان لەسەر ئەو دێیە داناوە چون شێخ وپیاوچاکی زۆر لێ بووە.

ئێستاش قەبرستانی بەناوبانگی لێ هەن وەک : **کاک ئەحمەدو کاک مەحموود، شێخ ئەحمەدی سوور، شێخ شەهابەدین ، چاکی فەقێ یان چاکی سلکان و پیر داود و** ....رۆژی جێژنان خەڵکی ناوچە دێنە سەرئەو چاکانە و بەخۆشی رای دەبوێرن.

چاک وپیری دێی شیخان نەخۆش ودەردەداری دەبەنە سەر وجێی مراد و نیازانە.

ئاوڕدانێک
وەسەر مێژووی کوردستان

عەبدولحەمید حوسێنی

# کورد...؟

٢

بە چاوپێداخشاندنێک بە مێژووی جوغرافیایی ئەم ناوچەیەدا ،کەبە (ماد) ناسراوە دەردەکەوێ کەلەم دووڕا و بڕوایە کامیان راستن وە کێهەیان لەگەڵ رووداوە ، مێژوویی یەکان دەگونجێن .

بۆسەلماندن یان بەرپەرچ* دانەوەی هەریەک لەو دوو روانگانە ،پێویستە کە لە مێژوو ، مێژوویی جوغرافیایی مادەوە ئەوتۆرەمە ئێرانی وغەیری ئێرانی یانەی کەلەم ناوچەیەدا ژیاون بکۆڵدرێتەوە. بەڵام بەرلەوەی بێینە سەر ئەم باسە، پێویستەبگوترێ کە هەر وەک ئەمڕۆ گەلی کورد لەتۆرەمەیەکی زۆرپێک هاتووە، لە سەردەمی مادیشدا گەلەکەمان لە تۆرەمەی زۆر ولە یەکتر جیا پێک هاتووە، کە هەموویان لەم ناوچەیەدا کەئەوێ رۆژێ بەماددەناسراو ئەمڕۆ بەکوردستان ناودێرە ژیاون، بەڵام لە بڕگەکانی* مێژوویی دا ، هەرکام لەم تۆرەمانە بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵ بووبێ و دەسەڵاتی ناوچەیی بەدەستەوە

گرتبێ، گەلەکە بەخۆی* بە
ناوی ئەم تۆرەمەوە ناسراوە
ئەم مەسەلەش تەنیا بە
بەژنی گەلی کورد نەبڕاوە
ڕۆژێک گەلانی دیکەش
بەسەرهاتێکی ئەوتۆیان
هەبووە، بۆ وێنە:
ئالمانی یەکان بۆخۆیان
بەخۆیان دەڵێن " دۆیج "
ئینگلیسەکان پێیان دەڵێن

جەنووبی گۆلی وان ودراوسێ
نەتەوەی سوویازوو بوون.
"مادەکان لەدەوروبەری
٢٥٠٠ ساڵ پێش میلادەوە
بابل یان داگیر کرد و٢٢٤
ساڵان لەوێ پادشایەتیان کرد"
دیارە مەبەست لە
مادەکان دانیشتوانی هەرێمی
کارداکایە، کەکوردەکانی
وشەی ماد، لەسەدەی نۆهەمی

پیلسێریان تێک شکاندووە.
گوێرە*کانی وشەی (کاردا
کا) کە بە بڕوای نووسەر
هەر ئەم وشەیە کەگۆڕانی
بەسەردا هاتووە وبووە بە
"کورد" لەمدەقە ئاشووری،
وێنانی، وهەرمەنی یانەدا
کە بەر لەسەدەکانی پێش
میلادەوە نووسراون وەدەست
ئێمە کەوتوون،بەمجۆرەیە:

"ژێرمەن" وفەرانسەیەکان و
ئیتالیایەکان پێیان دەڵێن
" ئەڵمان".

بۆ زوون بوونەوەی ئەم
راستی یەش کە کورد و ماد
یەکێکن پێویستە لەگۆڕانی
مێژوویی وشەی ماد و کورد
بکۆڵینەوە.

تورۆدانگین کەیەکێک لە
خۆرهەلات ناسەکانی هەرە
بەناوبانگە ومەزن ترین
پسپۆڕی خوێندنەوەی بەردە
هەڵکەندراو (سنگ نوشتە)ەکان
وسواڵەت (لوحە)ەکانی
ئاشووری بووە،لەسەر دوو
گوتەبەردی شیپ*انە کە
مێژوویان بۆ٢٠٠٠ ساڵ پێش
میلاد دەگەڕێتەوە ناوی
هەرێمی "کارداکا"ی بۆ
خوێندراوەتەوە کە کەوتۆتە

پێش میلاد بۆیەکەم جار لە
دەقەکانی ئاشووری هاتووە
بەڵام وشەی "کارداکا" لە
٢٠٠٠ ساڵ پێش میلادەوە
لە سواڵەتەکانی ئاشووری
نووسراوە ووەک نەتەوەیەک
ناسراون .

لەسواڵەتێکی دیکەدا کە
مێژووەکەی بۆ ١٤٠٠ پ .م
دەگەڕێتەوە پێوەندی بە
پاشایەتی "ئاردانانا" وە
تیگلات پیلسێری یەکەم ( ١٠٩٨
١٠٦٨)پ .م لە کێوەکانی
ئازوو کە بەبڕوای درایور
کێوەکانی هازوو واتە
زنجیرەکێوی "ساسۆن" کە
کێوەکانی کوردستانی تورکیە
دەگرێتەوە دەگەڵ نەتەوەیەک
بەناوی "کورتی" بەشەڕ
هاتووە،وکورتی یەکان تیگلات

ئاشووری: کارداکا ،کاردا
کارداک ، کاردۆ، کارتی
کورتی، کورتی وگووتی.

وێنانی: کاردۆک ، کاردۆ
یکای، کاردۆسوی ،کاردخۆی
کوردخۆی ،کەردۆک .

هەرمەنی: کوردۆئین
کورجیخ .

وشەی "ماد" بۆیەکەمجار
لە بەردە هەڵکەندراوەکانی
ئاشووری"شەڵمان سەری یەکەم
٨٣٨ پ .م. بە گوێرەی
"ئامادای" هاتووە ، لە
دەقەکانی ئاشووری،هەرمەنی
وێنانی وئێراندا گوێرەکانی
وشەی "ماد"بەمشێوەیە:

ئاشووری: ئامادای،مادای
ماتای .

هەرمەنی: مار ـ ک

وێیانی : میدوی .

فارسی لەمێژینە (فارسی باستان):مادە .
فارسی نێوەراست :مای ماسی .
وشەی "مای"لەدەقەکانی مێژوویی وئەدەبی ئێرانی پاش ئیسلامەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، و بووە بە"ماە"و ماناکەشی لە کیشوەر یا هەرێمەوە گۆڕاوە،بووە بە شار، وەک لەنێو ئەم شارانەدا دەبیندرێ:
ماەنهاوند = شاری نەهاوەند
ماەکوفە = شاری کوفەی .
ماەدینور= شاری دینەوەری.
فەخرەدین ئەسعەدگورگانی (٤٦٦ کۆچی) لەچیرۆکی ویس و رامین دا وشەی " ماە" ی هەر بە مانا مێژوویی یەکەوە واتا بەمانای کیشوەر و

سوی مروش کسی کن با
دل شاد
ترادارم چوجان خویشتن
شاد
زمین ماە را هموارە
آباد
زمین ماە یکسر باد
ویران
چودشت ریگ وچون شور
بیابان
وگرنە بوم ماە ازکین
شود پست
پس آنگەچون توانی
زین گنەگشت
ئەردەشیری بابەکان لە "کارنامەی ئەردەشیری بابەکان" دا لەدانیشتوانی دەولەتی "ماد" ناو دەبا :
ئەردەشیر لەشکرێکی مەزنی لەزاولستانەوە پێک

کرد ولەناکاو بەسەرئەوانی دادا، هەزار کەسی لە کوردەکان کوشت و ئەوانی کە تێک شکاووبریندار بوون بە دیلی گرتن وتالانێکی زۆری لەپادشای کوردەکان ورۆلەکانی کرد بەم پێ یە بۆمان ساخ بۆوە کە:
الف – وشەی " کورد" هەمان وشەی مێژوویی و لەمێژینەی "کارداکا"یە کە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە کورد.
ب – لەدەقە کۆن و مێژوویی یەکاندا لە دانیشتوانی هەرێمی "ماد"و بە"کورد" ناو بردراوە ،و هیچ جیاوازی یەک لەنێوان کورد ومادا نیە، واتە هەر دوو وشە ناوە بۆیەک

هەرێم بەکار هێناوە:
بەشوهر بود شهرو را
یکی شاە .
بزرگ ونامور ازکشور
ماە
مدار اورا بەبوم ماە
آباد

هێنا وڕای کردە سەر "کوردان شای ماسی".
"لەشکری ماد پێی وابوو کە ئەردەشیر تێک شکاوە و بەرەو فارس پاشەکشەی کردووە،دادەمرکێ. ئەردەشیر چوار هەزار کەسی ئامادە

نەتەوە ئەم نەتەوەیەش لە هەرێمی "ماد"دا کەپێ تەختە – کەی شاری هەگماتانە (جێی کۆڕ لێ بەستن) واتە شاری هەمەدان بووە، ژیاون .

# عیرفان

ع-سەمەدی

عیرفان مەکتەبی هەرە پێویستی مرۆڤ ، بەتایبەتی مرۆی ئەم سەردەمەیە .عیرفان بەپێچەوانەی زوربەی هەرە زۆری مەکتەبەکانی دیکە "خۆبە زۆر زانی،هەوا ،فەرمانڕەوایی بەسەر یەکداکردن، درۆ ،فێڵ ، ئیشتیای سەرۆکایەتی وخەڵک لەژێر چۆک نان و..."نەبووەو نابێ .

ئەگەر بێتوو تاریفێک بۆ ئەو مەکتەبە بدۆزینەوە دەبێ لەنێو قسەکانی ڕێرەوانی عیرفان (یانی"عارف")ەکان دا بگەڕێین ،چونکە جوانترین و باشترین ونزیکترین تاریف بەو مەکتەبە هەر لە لایەن ئەوانەوە گوتراوە.چۆن و چ کەسێک وەکی ئەوان لە نێوەرۆکی عیرفان گەیشتووە ؟!

"شێخ ئەبولقاسمی قوشەمیری" دەڵێ:" الدخول فی کل خلق سنی والخروج من کل خلق دنی" .

هەڵبەت تاریف لە عیرفان زۆرە ،بەڵام ئەگەر هەزاریش بێ هەر یەکە بەچەشنێک دێتەوە سەر ئەو تاریفەی"قوشەمیری " عارفەکان پیاوی عەمەل بوون نەک قسە .ئەوەی ویستوو- یانە بە خەڵکی بڵێن بەکردەوە گوتوویانە .هەر بۆیە کەسێکی وەک شەمسی تەورێزی تەنانەت لاپەڕەیەکیشی لەدوا بەجێ نەما . ئەوانەش کەدواون و نووسیویانە ،کورت دواون و کەمیان نووسیوە . بەڵام بەم کەمی یە هێشتا ماسی بیر و خەیاڵ شەکەت دەبێ ومەلەوانی ئەندێشە لەپێ دەکەوێ و هیچیان ناگەنە بنی .

عارف حوکمی تەکفیروخراپە لەسەر کەس دەرناکا ، بەڵکوو دەگەڕێتەوەسەرخۆ و هۆی ئەم خراپە لە خۆیدا دەدۆزێتەوەو لەنێوی دەبا . بەڵێ بێ شک ئەگەر بێتوو هەرکەسە لەجیاتی چاو بەخەڵک هەڵێنان و لە مەردم خورد بوونەوە ،لەئاکاری خۆی بڕوانێ وبۆ چاک کردنی کۆمەڵ لەخۆیەوە دەست پێ بکا هەرچی پیس وناحەزی یە ریشەی وشک دەبێ . وەک مەولانا دەفەرموێ :

**ای بسا ظلمی کە بینی در کسان**
**خوی توباشد در ایشان ای فلان**
**اندر ایشان تافتەهستی تو**
**ازنفاق وظلم وبدمستی تو**

گرینگترین سەرچاوەی بیرو ڕای عیرفانی کتێبی "مەسنەوی مەعنەوی"یە کە مەولانا جەلالەددینی مەولەوی" عارفی گەورەی ئێرانی لەساڵی ۶۵۷ی کۆچی مانگیڕا تا کۆتایی تەمەنی لە شەش بەرگدا کە نزیکەی ۲۵۶۳۲ بەیتە دایناوە

چرای عیرفان "ئەوین"ە و لەم مەکتەبەدا گەورەترین بایەخی پێ دەدرێ . لێرەدا پەنجاو دوو کەلام لە سی و یەک عارفی گەورە هەڵبژێراوە کە هەریەکە بەتەنێ دەتوانێ ببێتە هۆی خێر و خۆشی و بەختەوەری .

**خواجە عەبدوڵڵا ئەنساری:**
**وەک چۆن مار لەکاژ دێتەدەر ،**
**لە خۆت وەرە دەر !**
**حەسەن بەسری:**

●  ●  ●

**گوتیان : یاشێخ ! چارەیەک ،**
**دڵەکانمان خەوتووە .قسەکانت کاری تێ ناکا ؟!**
**گوتی :خۆزگە خەوتبان، چونکە خەوتوو بەجوولەیەک وەخەبەر دێ !**
**دڵەکانتان مردووە .**

**بە ڕاچڵەکاندنیش وەخەبەر نایەن!**

●  ●  ●

**مالک دینار :**
**پرسیان : چ دەکەی ؟**
**وەڵامی داوە :لەسەر سفرەی خوا**

و لە فەرمانی شەیتان دام .

● ● ●

حەبیب عەجەمی

یەک پرسی :کە ئەم پلەوپایەت
بەچی پێ درا ؟
وەڵامی داوە :بەوە کە ، من دڵ
سپی دەکەمەوە وتۆ کاغەزڕەش
دەکەیەوە .

● ● ●

مووسا بۆ قەومەکەی خۆی‌دەدوا
یەک ڕاستەوە بوو یەخەی خۆی
دادڕی !
وەحی بۆ مووسا هاتەخوار ، کە
پێیان بڵێ :
دڵتان بۆقسەم دادڕن، نەک
کراس!

● ● ●

ئەبوو حازم مەکی

گوتی :تۆ لەرۆژگارێک دا ،
دەژی،کەقسە بەسەر کردووە ،
زانست بەسەر ئاکاردا زاڵە
کە وایە تۆگیرۆدەی پیس‌ترین
خەڵک وپیس‌ترین رۆژگاری .

● ● ●

خاجە عەبدوڵڵا ئەنساری

ئەگەر لەقسەی خۆت‌گەیشتبای ،
هەر دوو دنیات بەردەدا

● ● ●

شێخ رووزبەهان بەقلی شیرازی
( شێخ شەتاح)

تەنیا ئێمە بەجێ ماین
بێ کەس و هەژار ،
بێ یارو دوور لە دیار ،
گیرۆدەی کۆمەڵێکی نالەبار !

● ● ●

فەزیل عەیاز

سەردەمێک بوو فەخریان بە
کردە دەکرد
بەڵام ئێستا بە نەکردە !

● ● ●

شەمسی تەورێزی

مزگێنی یەکم لەدەروون دایە!
سەرم لەو خەڵکە سوڕ ماوە ،
کە بەبێ ئەم مزگێنی یە ،
خۆشحاڵن !

● ● ●

نەجمەدین رازی

زوربەی خەڵک ئەوانەن کە :
هێزی عەقڵیان لە تیشکی
ئەوین بێ نەسیبە !

● ● ●

ئیمام محەمەد غەزالی

رەسووڵ - سڵاوی خوای لێ بێ -
فەرمووی :
دڵ وەکی ئاسن ژەنگ دەگرێ !
پرسیان . یا رسوڵەڵڵا، بەچی
پاک دەبێتەوە ؟
فەرمووی :بەخوێندنەوەی قوڕ-
ئان و یادی مەرگ !
هەر وەها فەرمووی : من لە
نێوتان دەڕۆم ودووئامۆژگاری
دەر بۆئێوە جێ دەمێنن
پەندیان لێ وەرگرن .
یەکیان دەدوێ وئەوی تریان
نەدوێیە
ئەمانە (قورئان)و (مەرگ)ن .

● ● ●

ئیبراهیم ئیبنوموستەمەلی

خۆشەویستی یانی :
ئەوەی دڵت پێوەیەتی
بیخەیەبەرپێی خۆشەویستەکەت!

● ● ●

شێخ ئەحمەدی جام

وەک چۆن ژیان بەستراوە بە
نان ،
بەوجۆرە ئیمانیش بەستراوەبە
زانست!

● ● ●

هجویری

سۆفی ئەوەیە کە ،
بیرو هەنگاوی یەک بن !

● ● ●

خاجە عەبدوڵڵا ئەنساری

یا رەببەنا !
بە دەردی خۆم دەزانم‌ودەرمانی
نازانم !
یا دەرمانی دەزانم و لەکار
هێنانی نازانم

● ● ●

بەشەر حافی

هیچ هاونشینی‌یەکم نەکرد ،
مەگەر ئەوەی کە
پەشیمانیم کێشا .

● ● ●

عەبدوڵڵا ئیبنوموبارەک

تۆزێک ئەدەب ،لەکۆیەک زانست.
باشترە !

● ● ●

داود تایی

چاویان پێ کەوت‌کە بەرە و
نوێژگە هەڵدەهات!
گوتیان : چ پەلەتە ؟
گوتی :لە دەروازەی شارلەشکر
چاوەڕێمە !
گوتیان: کامە لەشکر ؟
گوتی : لەشکری مردوان!

● ● ●

ئەبوو سولەیمان دارایی

رۆژێک شێخ جل وبەرگی سپی
کردبووە بەر ،
دەیشگوت : خۆزگە دڵی من لە

ناو دلاَندا ،
وەکی کراسەکەم بوایە لەنێو
کراساندا !

● ● ●

ئیبنوو سوماک
خەلکی زەمانی زوو خۆیان
دەرمانی دەرد بوون .
بەلاَم ئێستا دەردی بێ دەرمانن !

● ● ●

شێخ ئەحمەدی جام
عیلم بە زانینە ، نە بەوتە !
زۆرن ئەوانەی شارەزان و
نادوێن ،
هەیە ،دەدوێ وناشارەزایە !
نە وتە هۆی زانستە ،
و نە بێدەنگی هۆی نەزانین!
بەلاَم کردەوەی ڕاست نیشانەی
عیلمە ،
و کردەوەی چەوت نیشانەی
جەهل !

● ● ●

ئیمام محەممەد غەزالی
هیچ شەهیدێک لەوە گەورەتر
نیە کە :
لە بەرامبەر سولتانی زالمدا
وەجواب بێ و بکوژرێ

● ● ●

شێخ ئەبولقاسم قوشەیری
عەبدوللاَی موبارەک دەلێ :
لە بەرامبەر دەست ڕۆیشتووە
ـ کاندا خۆبەزۆرزانین،
ولە حاستی دەستکورتەکان خۆ
بەکەم دانان ،

● ● ●

رابیعەی حەلەبی
چوار درەمی دایە کەسێک و
گوتی :
ـ لەتکە بەڕەیەکم بۆ بکڕە !
پێی گوت :ڕەش بێ یان سپی ؟
پوولەکەی لەدەست وەرگرتەوەو
لە چۆمی هاویشت ،
و گوتی :هێشتا نەمکڕیوەغەمم
بۆپەیدا بوو ـ کە :
ڕەش بێ یان سپی ؟!

● ● ●

شێخ ئەبوسەعید ئەبولخەیر
شێخی ئێمە دەیگوت :تۆنەزانی
و ناشزانی کە نەزانی !
و ناشتەوێ کە نەزانی !

● ● ●

حەسەن بەسری
پرسیاریان کرد :
ـ مسولمانی چیە ومسولمان
کێ یە ؟
گوتی :مسولمانی لەکتێبدایە
و مسولمانەکانیش لەژێر خاک!

● ● ●

مالک دینار
دەیگوت : دۆستایەتی ئەهلی ،
زەمانە وەکی خواردەمەنی
بازاڕە !
بە ڕەنگ و بۆ ،
بێ تام و پیس!

● ● ●

یەحیا باخزری
ڕۆژێک دێ کە ،
دەست ڕۆیشتووەکان،بۆ سەیر و
سەیاحەت
بۆرە پیاوەکان، بۆتوجارەت ،
پیاوە ئایینیەکان، بۆ خۆ
نواندن
وهەژارەکانیش بۆ سوالَ دەچن
بۆ حەج !

شێخ ئەحمەدی جام
فام وتێگەیشتنی خەلکی ئەم
زەمانە ،
لەو قسانە ،
گەلێک دوورە !
چونکە هێشتا
چاویان لە لەتکە نانێکیش
نەپۆشیوە !

● ● ●

ئەی عەبدی من !
وەختێک ئەسرین هەلدەوەرێنی،
باوەکوو بارانی ڕەحمەت بە
لەشتدا بباری .

● ● ●

عەزیزەدین نەسەفی
"ئادەم" روحە و "حەوا" جەستە

* * *

نوێژێکی تۆ ، بەبێ تۆ
باشترە لە حەفتا نوێژی تۆ ،
لەگەلَ تۆ !

● ● ●

وای لێهات لە کۆت وزنجیریان
کرد وبردیانە شێتخانە .
دەستەیەک هاتنە دیدەنی و
گوتیان : ئەوە شێتە .
شبلی گوتی:من شێتم و ئێوە
ژیر ؟
خوایە ! شێتی من وژیری ئەما
ـ نە زێدەتر بکە !

● ● ●

شەمسی تەورێزی
گاورەکانم خۆش دەوێ !
چونکە داوای دۆستایەتی
ناکەن ،
و لە راستەوە دەلێن ،
گاورین و دوژمن .

ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەدەبی پێشکەوتووی هەموو گەل و نەتەوە و کۆمەڵێک بناغەو بنەرەتێکی هەیە کە ئێستا پێی دەگوترێ فۆلکلۆر یا کەلەپووری نەتەوایەتی.

فۆلکلۆر کە پێشینەیەکی مێژوویی کۆنی هەیە لە هەزاران ساڵەوە تا ئێستا پشت بەپشت و دەم بە دەم هاتووەتە خوار وبووەتە گەنجینەیەکی بە نرخ و بایی دار بۆ کەڵک وەرگرتنی کاروباری کۆمەڵایەتی وئابووری و پەرەسەندن و تەنەوەی، هەموو جۆرە زانست و ئاگاداری یەکی پێشکەوتوو، چوونە سەری پلە وپایەی ژین وشارستانەتی وزۆر شتی دیکە کە بنج وریشەی چۆنەتی دەستەڵاتداری وخووو رەوشتی پێ قایم وپتەودەکرێ ودەبێتە هۆی دامەزرانبدنی هەموو چەشنە شێوە و رەوشتێکی مرۆڤەتی.

لەرۆژگارانی پێشوودا کەلەپووری نەتەوایەتی بە لای زاناکانەوە بایی و بایەخێکی زۆری نەبوو،کەمتر روویان تێدەکرد وئاوڕیان وەسەر دەداوە بەڵام لەم دوایی یانەدا گەلێک زانای ئوروپایی پاش وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆیان دەرکەوت کەفۆلکلۆری هەر گەل ونەتەوەیەک بە هەموو چەشن وتایبەتی یە- کەوە بۆ ناسین وناساندنی ئەو گەل ونەتەوە وبەرچاو خستنی هەموو دیاردەکانی ژیانی لەباری کۆمەڵایەتی و ئابووری وسیاسی وزانستیدا نەخش ودەورێکی گرینگ دەگێرێ.ئینجا ئەو زانایانە دەستیان کردە کۆکردنەوە و نووسینەوەی فۆلکلۆر و کەلەپووری نەتەوایەتی وتا رادەیەک کە ئێستا زۆر زانا وڵاتە و وڵات وشارە وشار دەگەرێن و لەنێو گەل و نەتەوە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا دەخولێنەوەولەگەڵ شارەزایانی ئەو گەل و نەتەوانەدا کۆ دەبنەوە و لەبارەی هەموو چەشنە

سەدیق بۆرەکەیی

فولکلۆرێکی ئەو گەل و نەتەوانە دەکۆڵنەوە و دەنووسنەوە.

کەلەپووری نەتەوایەتی کە بەرهەمی هەزاران ساڵی هەر گەل ونەتەوەیەکە بریتی یە لە:

بەیت ، وێنە ، گەمە یاری ، گۆرانی ، هەڵپەڕکێ شێوەی خواردن وخواردنەوە، داب ونەریتی کۆمەلایەتی کاسەوکەوێلێ نێومال، بیرو رای کۆن، راووشکار، چەک، پیشە وئەستێرەوانی و...

کورد لەبەر ئەوە کە گەلێکی کۆنە وپێشینەیەکی مێژوویی دوور و درێژی هەیە لەباری فۆلکلۆری یەوە زۆر دەولەمەندە بەلام بەداخەوە بەهۆی ئەوە کە ژیانێکی سەرجەمودامرکاوی نەبووە وشرپوشپرزە بووە نەیتوانیوە تا ئێستا ئەو گەنجینە نەتەوایەتی یەی خۆی کۆ بکاتەوە ولەژیانی خۆیدا کەلک و سوودی لێ وەربگرێ .

بەرجی ئەو بەیتانەی لەنێو چوون وهەرناویشیان نەماوە، ئەوەندەی هەمانە و لەبەردەستانە ئەگەر بەوردی سەرنجی بدرێتێ و بەدەست وبرد خەریکیان بین وبۆپاراستن و زیندوو کردنەوەیان حەول بدەین لە گشت بارێکەوە بێ نیاز دەبین ولەرێبازی ژیاندا وەپێشمان دەخا.

بەشێک لە فولکلۆری کوردی بریتی یە لە:

بەیت کەدانەری ناناسرێ بەلام لەروزگارێکی کۆنەوە سنگ بە سنگ هاتوونەخوارو لە هەر دەورەیەکدا هەندێکی لێ کەموزیاد بووە وەک: مەموزین ، بارامو گولەندام، خوسرەو شیرین، شیرن وفەرهاد ، لەیل و مەجنوون، شێخ سەنعان و... بەشێوەی کلاسیک گوتراون . دەستەیەکی دیکەش لەقالبی فۆلکلۆردا ماونەتەوە وبە ئاهەنگی تایبەتی لەلایەن بەیت وگۆرانی بێژان دووبارە دەخویندرێتەوە ..

بەیتی مەموزین لەلایەن شاعیری بلێمەت و گەورەی کورد شێخ ئەحمەدی خانی (١٠٦٢- ١١١٨) بەشێوەی شیعری کلاسیک دارێژراوە کە لەو پەڕی جوانی و رازاوەییدایە و تا ئێستا بە چەند زمان تەرجەمە کراوەتەوە. زانا وئەدیبی هەندەران چیرۆکی مەم و زین بەیەکێک لە چیرۆکە هەرەجوانەکانی ئەوینی رۆژهەلات دەزانن و بایی و بایەخێکی زۆریان بۆ شیعری ئەو چیرۆکە داناوە و شاعیرەکەیان لەرێزی شاعیرانی بەناوبانگی ئەدەبی جیهانی داناوە.

گوتمان بەیت بەشێکە لە فۆلکلۆر کە لەباری شیعری یەوە چەند جۆرە و لەباری نێوەرۆکیشەوە چەند بەشە. هەندێکیان لە چوار چێوەی شیعری بیست هێجایيدان کە لەئەدەبی کوردیدا لە کۆنەوە باوە وەک: شیرن وفەرهاد ، خورشید و خاوەر یوسف وزلێخا ، قارەمان و قەیتەران و...

دەستەیەکیش قافیە و کێشی دیاری کراویان نیە وەکوو: گەنج خەلیل،حمیالی -گاسموو...

هەندێکیش کێش وقافیەی تایبەتی یان هەیە و بە نەزمێکی تایبەتی دەگوتر- ێنەوە وەک: بەیتی لاس و خەزال ، خەج وسیامەند ، برایمۆک ، فریشتەو....

دیارە هەرکام لەم بەیتانە بێچمێکی شیعری تایبەتی یان هەیە.

ئەوە لێرەدا ناوی چەند بەیت کە لەم دوایی یەدا بەهۆی هەندێک نووسەر و ئەدیبی گەلەکەمان کۆکراونەوە دێنین. بەم، هیوایە ئەوانەی لەو بارەوە کارێکیان لەدەست دێ بەرهەمی کارەکەیان بە زوویەکی زوو بخەنە بەرچاوی خەلک، بۆ ئەوە کە ئەم خەزێنە بایی دارانە لە فەوتان ونەمان بپارێزرێن .

ئەمەش ناوی بەیتەکان بەپێی پیتی ئەلف وبێ :

ئازیز
ئاسکۆڵە
ئاسمان و زەوی
ئاغای بەمێزەریان
ئاگری
ئایشە گوڵ
ئەحمەدی شەنگ
ئەسمەر خان
ئەوداڵ و ئۆمەر
ئەوسانە
ئەهنەساو بەهنەسا
ئیمامی هەمزە
بابکۆ
باپیرە
بارام و گوڵەندام
باژاری
باشووی زۆزانان
باوانم
برایمۆک
برزو و فلامەرز
بلە
بۆری میرسێوەدین
بۆز بەگ
بولبول
بۆهۆزی برینداری
بەبری بەیان
بەدرخان پاشا
بەهارە
بەیتی ساڵحی قاوەچی
بەیتی عەلی بەردەشانی
بێژەن و مەنیژە
بێڵندانا
بێماڵە
پایزە
پەرێزی پێمەردان
پیادەی کەڵهوڕ
پیربوداغ

پیرو بایز
پیرۆزە
پیرێژن وسەی بۆڕ
پیری ژیر
تاقە سوارە
ترکانە
تیری گەرووماری
جانۆ
جمبالی
جمجمە
جوانمێر و دایکی
جۆڵندی
جەعفەر ئاغا
جەنگنامەی کەهیا پاشا
جەهانگیر و رۆستەم
چیرۆکا مالە فارس ئاغا
حەتەم
حەمە حەنیفە
حەنیفە
حەوت پەیکەر
حەوت خوانی رۆستەم
حەوت دەروێش
حەوسەت
خالید ئاغا
خانی قەیغان
خوازێ
خورشید و خاوەر
خەج و سیامەند
خەزاڵ
خەزێم
خەیاڵ
دادوەرە
درەخت نامە
دمدم
دوانزە سوارەی مەریوان
دۆنۆ مایمۆ
دەلایلۆ

راوە پڵینگ
رۆڕۆی یای گوڵ
رۆستەم
رۆستەم بەگ
رۆستەم و زەردە هەنگ
رۆستەم و زۆراو
رۆڵەڕەوادی
رۆڵەی دایکێ
رۆڵەی نەبەز
روێل
رەشە راو
زازایی
زاڵم
زستانە
زۆزانا کورمانجی
زەڕدەشتی
زەردە هەنگ
زەمبیل فرۆش
زەینەڵ
سایل
سترانا جاسمۆ
سترانا فەرخۆ
سمکۆی مەزن
سنوور
سوارۆ
سوارە
سوارەی جوانڕو
سوورە گوڵ
سەعید ومیرسێوەدین بەگ
سەیدەوان
سەگی گورمانجەتی
شاربازێڕی
شاریار
شازادەی شادی
شاکەومەسوور
شامەیموون
شا هەڵۆی رەوەندی

شای زەند
شوانە
شیرن وفەرهاد
شۆڕ مەحموودو مەرزینگان
شۆڕە لاو
شۆڕە لاوی زەند
شەڕە تولە
شەڕە های شەڕە
شەڕی ئووسەزاری
شەریفە
شەریف هەمەوەن
شەم و شەمزین
شەمێ
شەنگە
شەوونیوەشەو
شێت و ژیر
شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینان
شێخ عەبدولقادر
شێخ فەرخ وخاتوون ئەستی
شێرکۆ
شیرۆ
شێر وشەپاڵ
شیرن وشەفێ
شێری نەبەز
شینی جوانمێرێ
عوسمان پاشای بەبە
ئەورەحمان پاشای بەبە
عەتانامە
عەلی هەریری
عەودالێ
عێزەددین شێر
خەرمان و گولێ
فەرهەت ئاغا
قارەمان وقەیتەران
قەرو گولە زەڕ
قۆچ عوسمان
قەبر

کاک باپیری مەنگوڕ
برایموەمەحمەلێ دەشتیان
کاک سەعیدی بەبە
کاک سەلیمی ئازادخانی
کالێۆ
کاکەسوار
کاک هەمزە
کاک هەمزەی مەنگوڕ
کا نەبی
کانەبی وخواز
کانەبی و نەعمان
کوردستان
کورد و گۆڕان
کۆرکەمالێ
کورمانجی
کورە کەچەڵ
کولە وعەینەمەل
کولێنگۆ
کوێستانی
کەڵ و شێر
کەڵەئەسپ
کەوێڵ
کیسەڵ
گاسمۆ
گۆران
گۆرانشا
گۆرانی
گوڵان گوڵان
گوڵناز و کەڵاش
گوڵەزەر
گەنجۆ
گولێ گولێ
گولێ و کابەنگەڕوو
گەڵباغی
گەلۆ
گەنج خەلیل
لاس و خەزاڵ

لاوی سووربەش
لۆڕ وسۆران
لەشکری
لەیل و مەجرووم
لەیلا
ماینی شێ
محەمەد خان
مزگەوت و میرزا
مەلای گۆڕەمەڕی
مەموزین
مەمی ئالان
میرامە
میری ڕەوەندی
میری موکریان
مێهر و وەفا
نادرشا
نادرنامە
ناسرو ماڵماڵ
نەخشی بیست ویەک
نیوەشەو
وەران
وەرەق و گوڵ
وەنەوش و بەرەزا
وەنەوشە
هاوێنە
هەراوەڕاوە
هەسپی ڕەش
هەڵپەڕینەوەی کورمانجەتی
هەڵۆ
هەورامانی
یاری
یای ئەستی
یای گوڵ
یۆسف بازاری
یۆسف و زلێخا
یۆسف و سەلیم

ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی

# زەینەڵ و گۆزەڵ

بەهارە ، ئەوە بەهارە گەیوەتەوە گۆزەڵێ
یارەبی چۆمەكەی شەمامكێ بەقوڕێ گیرێ
لە گۆزەڵی زەینەڵێ برالە دەخوڕێ
ئەوڕۆ وەرە برالە ئەمن بۆت دەڵێم
بە دەشتەكەی شەمامكێ
ئەگەر* تیری تێ نەدەچوو
لەبەر سەرگەل و مێگەلان
تۆ خوداكەی دەگەڵ جەلەبی دەكاوڕی
ئەرێ برالە ئەمن جەندم پێدەكوتی:

كوڕە زەینەڵ بابم ئەتۆ بەقایە مەكە
بەوان شل وەمل و گەردن كێل و دایكی كوڕی
ئەمن ئەوڕۆ بۆت دەڵێم بە بۆروبدەوان
بە یەخترمەخانەكەی كاكە زەینەڵی
ئەگەر دەپسێننەوە پاش بەندوپێش بەندی
بەبێ ساحێب سمكۆڵیان دەكردەوە لەئاخوڕی
ئەی برالە ئەمن ئەوڕۆ دەمكوت
هەركەس بە دەركی واندا رابرێ
وەكور زەینەڵی برام

لە دارەتووی دەرکێ حەمەدی بازەڵان
لە ئیمام ئەعزەمی
گوێیان دەدا لە قولاپی دەزێڕی
سەری لە قەڵاتی بەدەنی دەبڕی
ئەی برالە بابم زەینەڵی دەزوراری
کوڕە برالە ئەوە بەهارە بابم
ئەوە بەهارێکم لێ گەیوەتەوە
لە گۆزەڵێ
رەببی چۆمەکەی دەشەماکێم بەقوڕێ گیرێ
لە گۆزەڵی سەر بە تاڵێ
ئەوڕۆکانە لە من دەداتەوە چەلانێ
ئەی برالە زەینەڵ
ئەمن بەندێکت بۆ دەڵێم بەبۆروبدەوان
بە دەشتەکەی دەشەماکێ
ئەگەر تیری تێ نەدەچوو
لەبەر نێر و بەرانی زەینەڵی برام
دەک نەمێنم لەگەڵ مێگەلان
ئەی برالە بابەکەم زەینەڵ گیان
ئەمن دوو کەسم دەدین
ئەگەر یەکیان زەینەڵی برام بوو
یەکیان مێرە مەمی کوڕی برایم پاشای
یەمەنێ
ئەگەر دەیان ختسەوە زیندانێ
لەسەر خاتووزینی خوشکی میرزێنەدینی میر
ئاودەلان
ئەی برالە وەی بابم زەینەڵی دەزوراری
ئەتۆ ئێلچی شای بووی هەر بەخوونکاری
کوڕە برالە ئەمن چەندم دەکوت
غەزەبی گەورەی خۆت گەلێک زۆرە
بابەکەم زەینەڵ برالە وەک بارانی پەڵەی
وەک سێڵاوی دە بوهارێ
هەر بە شانی نۆکەری دادەبارێ
ئەتۆ ئێلچی شای پیرخدری بە پڕکاری
غەزەبی ئەوان ئاغایان گەلێک زۆرە
وەکوو بارانی دە پەڵەی
وەکوو سێڵاوی دەبوهارێ

بە شانی نۆکەری دادەبارێ
ئەوە بەهارە بابم بەهارە گەیوەتەم
گوزەڵێ
ئەوە چۆمەکەی دەشەماکێ بەقوڕێ گیرێ
زەینەڵ گیانی من دەناڵێ
ئەوڕۆکەش بۆت دەڵێم بەدەشتەکەی شەماکێ
کاکە زەینەڵ ئەگەر تیری تێ نەدەچوو
لەبەر سەرگەل نەمێنم ئەوڕۆکانێ
لەگەڵ مەڕوماڵێ

ئەی برالە زەینەڵ گیان
ئەمن ئەوڕۆ زەینم دەدا دوژمنی زەینەڵی
برام
ئەگەر روویان دەکردەوە سەراپەردەی کاکە
زەینەڵێ
هەڵیان دەکرت سەرکێش و کراسان
بەبێ ساحێبی دەیان دا لەکۆڵی حەمباڵی
ئەی برالە تۆخوداکەی زەینەڵی دەزوراری
ئەتۆ ئێلچی شای پیرخدری هەربەخوونکاری
کوڕە برالە ئەوڕۆ بەهارە
بەهارێکم گەیوەتەوە گوزەڵێ
چۆمەکەی شەماکێم بەقوڕێ گیرێ
ئەوڕۆکانێ لەمن دەداتەوە چەلانێ

نەسرین تورابی ...

ئێستا کاتی ئەوەیە لە بیری خۆم وخۆشکەکەم "مەگری " دابم. ئەگەر دایکم بمابایە لەژێر پەڕوباڵی گەرمی ئەودا باشتر دەژیاین و تووشی چەرمەسەرەوڕۆژەڕەشی ئەمرۆ نەدەبووین. هەرتاوە لایەکمان داغ نەدەکرا وهەر تاو لەماڵ دەرنەدەکراین. ئەگەر دایکمان بمابایە دوو ساڵی دیکە "مەگری" دەڕازاندەوە و دەینارده قوتابخانە ومنیش دەستم لە خوێندن هەڵنەدەگرت.

وەبیر ئەو ڕۆژانە دەکەومەوە وا دایکی دڵسۆزم کاری ماڵی دەکرد بوئەوەی من و خۆی تێر بکا و بە جل وبەرگی جوان بمڕازێنێتەوە. دەیناردم بۆ قوتابخانە و فێری دەکردم باش لە قسەی ماموستاکان گوێ ڕاگرم و تێکۆشم دەرسەکانم باش فێر بم. بەڵکوو نەدواڕۆژدا ئەوەی فێری بووم ببێتە تێشووی پشتی هەردووکمان وکەڵکی لێ وەرگرین.

بەڵێ، دایکم لەو بیرەدا بوو کە دواڕۆژێکی خۆش بۆ هەردووکمان دابین کا.

باوکم لەگەڵ باوەژنم (زڕدایکم) بە تێروتەسەلی وکۆک وپۆشتەیی لەماڵێکی خۆش دا دەژیان. منداڵەکانی باوەژنم تێروپڕو بەدەماخ بوون. دەتگوت گوڵی تێراون و باغەوان بە هەموو هێزی ـ یەوە ئاگاداریان لێدەکا. ئێمەی هەناسەساردیش لەلاوە بە هەزار ڕەنجوزەحمەتەوە ژیانمان ڕادەبوارد.

ئەوڕۆژەم هەرگیز فەرامۆش نەکردووە کە "مەگرێ" لەدایک بوو. کەس بەلای دایکمەوە نەبوو. تەنیا " باجی مینا " کچەکەی جارجار دەهاتن وسەرێکی دایکی زەیستان ونەخۆشیان دەدا و کاسە چێشتێکی گەرمیشیان بۆ دەهێنایەن. " مەگری " لەدایک بوو، وردە وردە گەورە بوو تەمەنی گەیشتە دوو ساڵان ومن دەبوومە دوازدەساڵە. باوکم لەتەواوی ئەمماوەیەدا خۆی لەئێمە نەگەیاند. دایکم لە کزی و کەنەفتی دا بوو دەتواوە، دەسووتا، بەرەو نەمان دەڕۆیی، بەرۆژ کاری

مالان وبه شەو کاری مالێ خۆمان. هەدادانـی نـەبوو. گۆرەوی دەچنی، گولـدۆز ی دەکرد، دایم چاوی سووربوو ئاخر قەت تێرخەو نەبوو.

ماندوویی و نەحەسانەوەی بێ پسانەوە کاری خۆی کرد. لە زستانی ئـەوسالـەدا نەخۆش کەوت. جاروبـار یاوی دەکرد،وەک تـەنـدوور دایساو لەنەکاو لـەرزی لێدەهات و لە تـەنـدووری داغت هاویشتبا گـەرمـی نەدەهاتەوە! ئەو رۆژانەی کە نەخۆش بوو نـەمتوانـی بچمەوە قوتابخانە و هۆشم بەدایکمەوە بوو. سەرم لێ شێویا بوو. لە لایـەک "مەگری" دەگری و لـە لایەک دایکم نەخۆش وبێ حاڵە. چ بکەم؟ چار چیە؟ لەو ناچاری وناهومێدی یەدا فکرێکم بەزەینی گەیشت.

رۆژێکیان کەدایکم زۆر هیلاک بوو، بەرەو مـالـێ باوەژن بەهیوای دیتنـی باوکم کەوتمە رێ. لەدرگام دا سامان کوڕی گـەورەی باوەژنم کە لەمن چووک تـر بوو درگای کردەوە.

– سامـان گیان سلاو، چۆنی؟ دایکت چۆنە،شیلان گیان چۆنە.باوکم لەماڵۆیە؟ زڕ برا بێ ئـەوەی جوابـی سڵاوم داتەوە گوتی:

– "بـۆچ هاتووی بـۆ مالی ئێمە؟ بابەم تۆی خۆش ناوێ! ئێوەی گەرەک نیە! برۆ! ئیتر مەیەوە بـۆ مالی ئێمە!"

– سامان تۆخوا، تۆ گیـان ئەم شیلانە نـازارە بـرۆ باوکم قاوکە! دایکم فـرە نەخۆشە! موحتاج دەوادەرمانە ئەمرێ!"

لەم وتانە دابووین کە دەنگی باوکم بیست. هاواری بەرز بۆوە:

– کێ بوو سامان،لەگـەڵ کێ قسە دەکەی؟

سامان جوابی داوە:

– پەیمان هاتووە باوە گیان!

باوکم هـەر ئەوەنـدە ناوی منی لەسامان بیست خوێنی وەجۆش هات ونەڕاندی

– ئێرە بۆ هاتووە؟ کێ وتوویە بێت بۆ ئێرە؟ چی دەوێ؟ دەڵێ چی؟ سـەت جارم وت لای من مەیەن! کارتان پێم نەبێ!...

دلم پڕببـوو. باوەڕم نەدەکرد لەدنیادا ئەوەندەش زولم ببێ! گریان ئەمانـی نەدام. سەرم بە دیوارەوەنا و دەریای فرمێسکم هەلڕشت لەخودا دەپاڕامەوەودەمنالاند کە باوکم هاتە بەردرگای کۆڵان. چاوی بەمن کـەوت ئەوەندەی تر رەنگی تێکچوو گوتی:

– کوڕە چت دەوێ؟ بۆ هاتووی؟

بەگریانەوە هـەرچۆنێک بوو حالێکی دایکمو"مەگری" خوشکم بۆگێڕاوە و داوای یارمەتیم لێکرد. سـەری

داخست .راماو چاوی لە
عەرزی بڕی. پاش ماوەیەک
گوتی :

ــ راوەستە لەگەلت دێم

رووناکی کەوتە دەروونم
دلّم خۆش بوو کە باوکم
بەزەیی پێمان داهاتووە و
دەفریامان دێ.دەستی سامانی
گرت و چوونەوە ژوور.پاش
ماوەیەکی زۆر کورتدەنگی
رایەکی تر دلّم سیس بوو
لە دلّی خۆمدا داوای
یارمەتیم لەخودا دەکرد.
کاتێک گەیشتینە بەردرگای
مالّە تێک رووخاوەکەمان
خورپە کەوتەدلّم.ئافرەتێکی
زۆر دەهاتن ودەچوون.دنیام
بەسەردا رووخا. بەدلمدا
هات کەدایکم حالّی خراپتر
بووە وئەو هاتووچۆیە
بۆیەیە. لە دلّی دام کەدایکم
بە بێ کەسی مردووە. خۆم
دەژوورێ راکرد. دیوی سارد
وسڕو دارووخاو پڕ بووە
لە ژنی دراوسێ. "مەگری"
بە باوەشی ستارە کچی باجی
میناوە گرووی گرتبوو
ژێر نەدەبووە. لە دلّی
خۆمدا ئەو گریانەبێ بەهانەم
بەخەبەری لێقەومان وئاوارە
بوونی خۆم ومەگری مانا
لێداوە! بەگریانەوە خوم
گەیاندە دایکم و پڕبەدلّ
ئامێزم پێداکرد. رەنگی
بەتەواوی هەلپرووکابوو .
فرمێسکی گریانی هەردووکمان
تێکەلّ ببوو، باوکم سەری
داختبوو. سووک سووک هاتە
پێش ، لە تەنیشت لەشی
بێ هێزی دایکم چۆکی داداو
دانیشت . دایکم هەموو
هێزی خۆی کو کردەوە و
گوتی :

ــ ئاغە مەحموو وەرەپێش!

باوکم سەری بردە پێش و
گوتی :

ــ مریەم بلّێ. هەرچی
دلّت ئەخوازێ بلّێ .

دایکم بە پشووی سوارەوە
گوتی :

ــ دلّم زۆرشتی گەرەک بوو
ئەلّبەت بۆمنالّەکانم.ئەمما
حەیف وا خوا ئەمانی نەدام
و منالّەکانم هەتیو کەوتن!
بەخوای ساحەب رەحمیان
ئەسپێرم. لەپاشان لەتۆم
دەوێ هۆشت بەلایانەوە بێ.
زۆر بێکەسن !

ئافرەتەکان هەموو
دەگریان .دایکم وەک لە
شوێن گومکەردەیەک بگەڕێ ،
بەچاو من ومەگری دیتەوە.
زۆر بەئیشتیا چاوی لێ
دەکردین ودەگریا .لێوەکانی
هەلّقورتان و...

پاش مەرگی دایکم،باوکم
من ومەگری بردەوە مالّێ
خۆی ، تا پرسە وسەرەخۆشی
تەواو بوو حالّی ئێمەش
باش بوو. لەمەودوا من
لەجێگای کچە عازەوی مالّ
بووم. کاسەشۆر و کەوچک
باوکم و قریشکە قریشکی
باوەژنم بەرز بۆوە. دیار
بوو باوەژنم زۆر تووڕە
بوو هەر دەی بۆلاند. پاش
نیو سەعاتێک باوکم بە
تووڕەیی لەمالّ هاتە دەرو
گوتی :

ــ رێکەوە بزانم چی
بووە !

پێم گوت :

ــ باوە تۆخوا بادوکتۆر-
ێک تەک خۆمانا بەرین !

ــ وس بە! دەبێ بزانم
قسەکانت راستن یاکو شەقت
دەوێ !

شۆر بووم.مەگری شۆربەختیش
حاڵێکی نەبوو.پاک وخاوێنی
ئەویشم بەعودە بوو.پەڕوو،
پاڵی ئەویشم دەشوت، هەموو
کارو فەرمانێکم بە دڵ و
گیان بەجێ دەهێنا.

ژێرخانێکی رەش وتاریکیان
دابوو بە من ومەگری. بۆ
ئەوەی دڵمان وەک ئەو
ژێرخانە رەش نەبێ"مەگریم"
سەرگەرم دەکرد. مەگری سێ
ساڵان بوو بەڵام هێشتا
نەیدەتوانی قسە بکا،
یان دەیتوانی نەیدەکرد!

رۆژێک لە حەوشەدا جل
وبەرگی "مەگری"م دەشۆرد
و هەر لەبیری ئەوەدابووم
کە بۆ زبانی ناپشکۆی* و
قسە ناکا کە لە نەکاو
دەنگێکی ناسکی منداڵانەم
بیست کە قیژاندی :

- کاکە گیان! کاکە
پەیمان! ئەی کاکەگیان!...

دەستم لەشۆردن هەڵگرت
و خێرا چوومە ژوور.ئەوەی
کە دیتم لەباوەڕدا نەبوو
"مەگری" کە هیوای دڵ و
گیانم بوو لەناو دیوەکەدا
بێدەنگ وبێ زبان کەوتبوو.
باوەژنم کوڕە ساواکەی بە
ئامێزەوە بوو دەی بۆڵاند و
دەی شریخاند. دەست وپای
"مەگری" بەتەواوی سووتابوو
باوەژن داغی کردبوواتەنیا
بەم تاوانە کە دەستی لە
دەموچاوی کوڕە ساواکەی
دابوو. نەمتوانی بێدەنگ
بم. بەسەر باوەژنمدا،
نەڕاند :

- زاڵم،لەخوا بێ خەبەر
ئاخر"مەگری" گوناهی چ
بوو؟ بۆچ وای لێدەکەی؟
ئاخر چ زەحمەتێکی بۆ تۆ
هەیە ؟"

ئەو ژنە دڵڕەشە لە
قسەکانی من هێندەی دیکە
تووڕە بوو. دامیە بەرشەق
وزللە. منیش تا توانیم
بەگژی دا چوومەوە و بە
شەق و زللە تێی بەربووم.
دەری کردم ئیتر دەربایست
نەبووم. "مەگری"م لەباوەش
کرد وبەرەو دەرمانگا
کەوتمە رێ. زۆر لە ماڵ
دوور نەکەوتبوومەوە کە
باوکم گەیشتە سەرم وبە
تووڕەیی گوتی :

- ئەم ئەتوارە چیە
لەخۆت دەرهێناوە؟ ئەو
کچە بۆکوێ دەبەی ؟

هیچم نەگوت تەنیا
برینی سووتاوی مەگریم
لەبەر چاوی راگرت.کەچاوی
بەو جێگە داغانە کەوت
واقی وڕما وچاوی دەرپەڕی
و پرسی :

- چ بووە، "مەگری" بۆ
وای لێهاتووە ؟

جوابم نەداوە. رێگام
گرتە بەر. حاڵی مەگری
زۆر خراپ بوو.لەدەرمانگا
برینەکانیان پانسمان کرد.
ئێش وئازار کەم بۆوە و
مەگری دەستەکورتەکانی
خستە دەوری ملم و چاوی
تێ بریم و بە تەتە،پەتە
گوتی :

- کاکەگیان بۆ دەگری؟
بۆ من دەگری ؟ بۆ من
دەگری ؟ من چاک بوومەوە.

کوڵم سەت هێندە بزووت.
بەسینگمەوە کوشیم.سوێندم
خوارد لەوژینە پڕمەینەتە
رزگاری کەم. خۆم بەپیاو
دەزانی.لێبڕام بەڕەنجی
شانی خۆم پەروەردەی کەم.
لەنێو ئەو هەموو پەژارە و
بەدبەختی یەدا دڵم بەوە
خۆش بوو کەزمانی بەرببوو
قسەی دەکرد.شوکرانەی خودام
بەجێ هێنا.

رۆژی دوایی سامان دوو
چۆلەکەی گرتبوو و لەناو
قەفەسی کردبوون . مەگری
گڕوی چۆلەکەکانی گرت و
دەگریا.من لەوبیرەدا نوقم
ببووم کە چارەنووسی من
و"مەگری" وەک هی ئەو دوو
چۆلەکە بەستەزمانە وایە.
دەنگی گریانی " مەگری"
بەرزتر ببۆوە. سامان
هەڵیکوتا سەری ودایە بەر
زللە وپێلاقە،دیسان خۆم
پێ رانەگیرا.سامانم بەپاڵە-
ستۆ و تێهەڵدان دوور،
خستەوە وچۆلەکەکانیشم
ئازاد کرد! زانیم پاش
ئەم رووداوە جێگایەک لەو
ماڵە بۆئێمە نامێنێتەوە.
زانیم کە بۆئێمەش کاتی
هەڵفڕینە ودەبێ بڕۆین!

# ئێمە و خوێنەر

تکا لەخوێنەرانی بەڕێزی سروە دەکەین ئەم خاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرن :

١- نووسراوەکان بە خەتێکی خۆش بنووسن وابێ بۆ خوێندنەوەی تووشی کێروگرفت نەبین .

٢- لە دیوێکی کاغەز بنووسن .

٣- ناونیشانی خۆتان تەواو بنووسن تا وەڵامی نامەکانتان بە دەست بگاتەوە .

٤- ئەگەر بابەتی وەرگەڕاو-مان بۆدەنێرن، ئەسڵەکەشی بۆبەراوەردو هەڵسەنگاندن ڕەگەڵ بخەن .

٥- ئەگەر دەگونجێ نووسراوەکان لە دوو یا سێ لاپەڕەی گۆوارەکە پتر نەبێ بۆئەوە جێگە بۆهەموو بابەتێک ئاواڵە بێ .

٦- دەستەی نووسەرانی سروە وەک گۆوارێکی فەرهەنگی- ئەدەبی دەتوانێ لەباری ڕێنووس وڕێزمانەوە دەست لە نووسراوەکان وەربدا .

٧- ئەو بابەتانەی بۆ ئێمەی دەنێرن لەباپەگانی-دا هەڵدەگیرێ و نادرێتەوە بەخاوەنی .تکایە نوسخەیەک لای خۆتان رابگرن .

دەستەی نووسەرای سروە

بۆکان: ئەمجەد فرووەمەند

نووسیوتە گۆوارەکانی دیکە لاپەڕەیەک بۆ وەڵام دانەوەی پرسیاری پزیشکی تەرخان دەکەن. ئێمەش لە سروەدا ئەگەر لەم چەشنە پرسیارانەمان لێ بکرێ تێدەکۆشین تا ئەوجێگایەی لەدەستمان دێ لەرێنوێنی دوکتۆرانی شارەزا کەڵک وەربگرین ووەڵامی بدەینەوە.

دیواندەرە :حوسێن قادرپوور

١- بە بڕوای ئێمەش بەشی هەورامی لە سروەدا کەمە بەڵام هۆی سەرەکی ئەم کارە ئەوەیە کە هەورامی زانێکی باشمان لە سروەدا نیە.دۆستێکی ئەدەبدۆستی هەورامی زان دەبێ یارمەتی ئێمە بدا و دۆستانی هەورامیش وتار و نووسراوەمان بۆ بنێرن و شیعر و فۆلکلۆر وباسی تەحقیقی و... ئەگەر بە زاراوەی هەورامی بێ وەکی خۆی چاپی دەکەین .

٢- تێدەکۆشین تا ئەو جێگایەی لەدەستمان بێ لاوان لە فەرهەنگی رەسەنی کوردی نیزیک بکەینەوە و لە ئەرک و پێ سپێراوی خۆیان ئاگاداریان بکەینەوە

نەغەدە: غەفوور بادپا

لە هاوکاری ودڵسۆزیت گەلێک سپاس .وەک هاوکارێکی دڵسۆز یارمەتی سروە بدەو ئەم وێنەی نووسیوتە بۆمان بەرێ بکە تا لە جێگەی تایبەتی خۆیدا چاپی بکەین .

خانێ:سولەیمان مودەڕیس

١- پیتی"ڤ" تایبەتی لەهجەی شیماله و لە لەهجەی نێوەڕاستدا جگە لە چەند وشەی وەک " بڤە" و "گڤە" ئەم پیتە دەکار ناکرێ. ئەم وشانە کە ئەم پیتەیان تێدایە شیمالین

و له لەهجەی نێوەڕاستدا "ڤ" دەبێ بە"و" وەک :

ئاڤ = ئاو

ناڤ = ناو

گۆڤار= گۆوار

چاڤ = چاو

ئەڤ = ئەو

راڤ = راو

٢- بەشی دەنگ وباسی وەرزشی لە گۆوارێکی مانگانەدا ناگونجێ .

سەقز: **محەممەد وسووقی**

ژیاننامەی مامۆستا هەژار لە کتێبی بۆ کوردستان شەرەفنامە و...دا هاتووە بەڵام بەکورتی دەڵێین مامۆستا هەژار لەئاوایی تەرەغە سەر بە مەحاڵی یەختەچی بۆکان لە دایک بووە وئێستا دانیشتووی کەرەجە .

ژیاننامەی مامۆستا هێمن لەپێشەکی " تاریک و روون"دا هاتووە .

قەڵادزی: **خدر شکاک**

پرسیارت کردووە کە هۆی چیە شاعیرانی کورد لە وشەی عەرەبی وفارسی کەڵکیان وەرگرتووە؟

لە وەڵامدا دەبێ بڵێین بەر لە هەموو شت دەبێ بگەڕێینەوە ئەو سەردەمە کە شاعیرانی کورد شیعریان تێدا گوتووە. سەردەمێک بووە لە کوردستان لەکار هێنانی وشەی عەرەبی نیشا - نەی خوێندەواری بووە و شاعیران ئەوکارەیان کردووە لەلایەکی دیکەشەوە زۆربەی شاعیران لەحوجرەی مزگەوت و خانقاکان پێگەیشتوون و زمانی کوردیش بۆ ئیستلاحاتی مەزهەبی زۆردەست کورتە وشاعیر ناچار بووە لە وشەی فارسی و عەرەبی کەڵک وەربگرێ .

بەڵام ئێستا دەبینین شاعیری کورد تا بۆی بلوێ لە وشەی رەسەن و کوردی خۆماڵی کەڵک وەردەگرێ. سەرەڕای ئەوانەش نابێ لەبیرمان بچێ کە هیچ زمانێک ناتوانێ واسەربەخۆ بێ کە لە زمانەکانی دراوسێی کەڵک وەرنەگرێ .

شنۆ: **هەژار عەبدوڵڵا**

سپاسی هەستی خاوێنت دەکەین بۆدیاری یەجوانەکەت دەستی هاوکاریت دەکوشین

سەقز: **زاهید کازمی**

پرسیارت کردووە بۆ کتێبی کوردی وەدەست ناکەوێ لەوڵامدا دەڵێین: هۆی سەرەکی ئەم مەسەلە ئەوەیە کە زۆربەی کتێبە کوردی یەکان لە هەندەران چاپ دەبن چون گیروگرفتی کاغەز لە وڵاتی خۆمان زۆر بەرچاوە. جا ئەم کتێبانە هەزینەیەکی زۆر هەڵدەگرن تا دەگەنە دەست خوێنەر و ئەو کەسە کە دەیهێنێ قازانجی بۆ ناکاودەبێتە هۆی ئەوە چەند کەس وەدەستیان بکەوێ

مەهاباد: **جەعفەر رەحمانی**

خوا یاربێ ژینامەی شاعیری بەناوبانگی کورد مامۆستا قانع بڵاودەکەینەوە. تۆش لەمبارەوە چت لەدەست دێ یارمەتیمان بدە.

نەخۆشینەکانیش لەسرووەدا جاروبار بڵاو دەبنەوە. هیواداریین بتوانین بەرێک وپێکی پێشکەشی خوێنەرانی بەرێزی بکەین .

بۆکان: **حەسەن کەس نەزانی**

براگیان شیعر بەشێکە لە ئەدەب بەتایبەتی ئەدەبی کوردی. بوونی شیعر لە گۆوارێکدا پێویستە وناکرێ شیعر هەڵوێرین. ئەگەر ئەم کارە بکەین بەشێکی زۆر لە خوێنەران رەخنەمان لێدەگرن. هەر شتێکی تۆ پێت خۆش نەبوو یا بەدڵتەوە نەنووسا نیشانەی ئەوە نیە کەبەکار نایە. هەر کەسە شتێکی پێخۆشە و دەیەوێ بابەتی دڵخوازی ئەو زۆر بێ. چاوەڕوانی هاوکاری پترین

نامەودیاری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە سپاسی هاوکاریان دەکەین .

نەغەدە: **بەدرەدین ساڵح**

خانێ: **مراد سۆهرابی**

: **ئیبراهیم قادری**

شنۆ: **محەممەدحوسێن پوور**

شیمالی کوردستان: **محەممەد سەلیم عیسا**

پاوە: **بورهان خالیدی**

# پوولدان

مارف ئاغایی

ڕێبوارەکان بە لەز بە لامدا تێدەپەڕین. هێندێکیان بارستی کوڵەباری خەم و پەژارە پشتی چەماندبوونەوەوزامی ئاواتە خنکاوەکانیان جەرگی بریندار کردبوون. بە نێوچاوانی پڕگنجەوە کە وێنەیەک بوو لە ژیانی پرسەخلەتیان بە بەر چاومدا ڕادەبردن. نۆرەی دەستەیەکی دیکە دەهات. ئەوانەی کە تامی خەمیان نەچێشتووە و ئێش و زامیان نەدیوە.

لەولای شەقامەکە پیرەپیاوێکی ماندووی داماو دەستی لە ئەژنۆ وەرێنابوو و لە نیزیک کتێبە تۆزاوی و پەڕپووتەکانی دانیشتبوو و بیری دەکردەوە و بەو تاسەیەوە کەبۆ کوتاڵ فرۆشێکی بە ئێرو نەبووە جەرگی جەرگی دەخواردەوە.

پێم لە ڕۆیین و چاوم لە ڕوانین نەدەوەستان. هەرکە وادەڕۆیشتم وەبیرم هاتەوە دەبێ بچم ماشێن بەکرێ بگرم و برا چکۆلە نەخۆشەکەم بەرمە لای دوکتۆر لە شاری ورمێ. بۆ وەرگرتنەوەی پوول بەرەو بانک وەڕێ کەوتم. سەردەمی گۆڕینی کۆپین بوو خەڵک بە نۆبە دەچوون بۆ ژوور. چوومە ناوسەفەکە،منداڵێکی هەشت ساڵانە لەپێش من ڕاوەستابوو پووڵدانێکی سوور و جوانی بەدەستەوە بوو هەڵیدەخلاند، تێی ڕادەما. لێی ورد دەبۆوە. دەتکوت چاوەڕوانە پووڵدانەکە قسە بکا. هەرکە شەقەی پوولەکانی گوێ لێ دەبوو بزەیەکی دەهاتە سەر لێو ئەوجار لەکەلێنی پووڵدانە-کەوە دەیڕوانی یە پوولەکانی. ئەو پوولانەی کە تمەن تمەن کۆی کردبوونەوە.

تافی منداڵیم دەهاتەوە بیر و ئێرەییم بەو منداڵە دەبرد چوون پێم وابوو دەتوانێ بەو پووڵدانە پڕ لە پوولە بە ئاواتی منداڵانەی خۆی بگا. جارجار هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشا و خونچەی پشکوتووی لێوی دەژاکا. دەمێک بە بزە و دەمێک بە کەسەر و کزەی دڵ سەرنجی دەدا، هەستم بەوە کرد کە ئەوەندە پوولە ناتوانێ ئاواتەکەی بەدی بێنێ و بیرکردنەوە لە ئەو مەسەلەیە دڵی ساوا و ناسکی دەشکێنێ. لەلای دانیشتم وکوتم:

ـ کوڕی چاکناوت چیە ؟

کوتی :

ـ ئارام

کوتم :

ـ ئەی بۆ دایکت یا باوکت لەگەڵت نەهاتوون ؟

کوتی :

ـ باوکم کارگەرە و دایکم، دایکیشم مردووە.

وشەی "دایکیشم مردووە" وەکوو ئاگرێک پۆلووی دامرکاو و لەگڕ کەوتووی دڵی پڕکوڵی گەشاندەوە و فرمێسکی پێهەڵوەراند. لە پرسیارەکەم پەژیوان بوومەوە و بۆ لاواندنەوەی دڵی زامداری دەستم کرد بە قسە :

ـ قەیدی نیە ئارام گیان، هەزاران کەس وەکوو تۆ دایکیان نەماوە بەڵام پیاوانە ڕاوەستاون وگەرچی خەمی دایکیانە بەڵام فرمێسکی بۆ نارێژن. تۆ چەندساڵی دیکە دەبی بە پیاو. دەزانی پیاو بەکێ دەڵێن ؟ بەو کەسە بتوانێ لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و جگە لەخودا پاڵ وەکەس نەدا. ئەگەر ئەورۆ ئەتۆ لەگەڵ دایکت هاتبایە ئێرە منداڵ بووی کەچی ئێستا تەنیا هاتووی. ئەتۆ

ئەورۆ پیاوێکی چونکە کاری پیاوێک دەکەی. بەلام ئەگەر دەگەڵ دایکت هاتبای منداڵێک بووی. گەورەیی و پیاوەتی بەقەلافەت نیە.

ئارام چاوە پڕئاوەکانی لەچاوم بڕی وبە هێمنی کوتی :

– مامە منداڵەکانی مەدرەسە هەموو دایکیان هەبە، بێجگە لە من ،هەر ئەمن بێ دایکم . ئەوێ ڕۆژێ ڕۆژی دایک بوو. هەموو منالەکان دیاری یان بۆ دایکیان کڕیبوو و دەیانبردەوە ماڵ کەچی ئەمن نەمدەزانی چ بکەم. ئاخری چەپکەگوڵێکم کڕی و چوومە سەر قەبری دایکم و کوتم :

– دایەگیان بریا زیندووبای لێچکەیەکی جوانم بۆدەکڕی. نەڵێی ئارام ئەتۆی لەبیر چۆتەوە، نا دایەگیان ئەتۆ قەت لەبیر ناکەم. شەو نیە خەونت پێوە نەبینم. دایەگیان ئەوشۆ زۆر زوو دەنووم هەتاکو زووتر تۆ ببینم. تۆخوا لەبیرت نەچێ دایە گیان بێ یە کنم."

ئەگەر ئارام لەوەزیاتر درێژەی بە قسەکانی دابا خۆم پێ ڕانەدەگیرا، بۆیە قسەکانم بڕی وکوتم:

– باشە دایکت بۆ مرد کوتی :

– سێ مانگ لەوەی پێش بوو دایکم دووگیان بوو ڕۆژێکی زۆر نارەحەت بوو بابم چوو مامانی هێنا بەلام دایکم تاو لەتاوێ خەراتر دەبوو مامانەکەش دەیکوت هیچ نیە .ئاخرەکەی زۆر نارەحەتبوو بردمان بۆ دوکتۆر. دوکتۆر پاش چەند سەعات ڕاگرتن کوتی لێرە چارەی نایە چونکە دەبێ عەمەل بکرێ ولێرەش نەخۆشخانە نیە. دایکمیان دەماشێنێ نا هەتا بیبەن بۆ شارێکی گەورە. منیش بەزۆری خۆم ڕەگەل خست لەنیوەی ڕێگا دایکم منداڵەکەی بوو بەلام خۆی مرد. دەستی لەنێو دەستم دابوو ئەگەر تەواو بوو. قەت ئەورۆژەم لەبیر ناچێ لەو ڕۆژەوە من بێ دایکم ئەو پووڵدانەش یادگاری دایکمە وبۆنی وی لێدێ. ئەودەمی بۆی کڕیبووم قەرار بوو ئەگەر پڕ بوو دووچەرخەی پێ بکڕم.چونکە دەیزانی من دووچەرخەم زۆر خۆش دەوێ.لەو ڕۆژەوە، کە پووڵدانەم داناوە پووڵم خەرج نەکردووە و هەموو پووڵەکەم کۆ کردۆتەوە. ڕەفیقەکانم هەموو دەزانن من پووڵم بۆ دووچەرخە کۆ کردۆتەوە دەڵێن خۆزگەم بەخۆت وپێیان خۆشە دەگەڵم بن بە ئاواڵ.ئاخە، قەرار بوو من سبەینێ چەرخی بکڕم ئەویش ئەورۆ گوێم لێ بوو دەوڵەتدەیەوێ نەخۆشخانە لە شار ساز بکا. منیش پووڵدانەکەم هەڵگرتو و هێنام نەخۆشخانەی پێ ساز بکەن دەزانی بۆ مامە ؟ دەزانی بۆ؟ بۆ ئەوەی کەسی دیکە دایکی نەمرێ. دایک مردن زۆر ناخۆشە مامە.

ئیتر هێزم نەمابوو. فرمێسک لەچاوانیدا پەنگی خواردبۆوە و هێدی هێدی دەڕژانە سەر کولمەگەش و جوانەکانی. بە دەنگی لەرزۆکی ئارام وەخۆ هاتمەوە کە دەیکوت :

– ئەرێ مامەڕاستەدەڵێن ئەمن هەتیوم؟

کوتم :

– نانا ڕۆڵە تۆ هەتیو نی. هەتیو ئەو کەسەیە باوکی نەبێ. ئەگەر ئەو جارەی منداڵان وایان پێ کوتی نارەحەت مەبە.چونکە تۆ نابێ لەبیرت بچێ کە پیاوی. پیاو بە قسەی منداڵان پەرۆش و تووڕە نابێ. نابێ قەتبۆ دایکت فرمێسک بڕێژی .

کوتی : نا مامە ئەمن بۆدایکم ناگریم چونکە بوومەتە پیاو.بۆیە دەگریم دەڵێم :

– بریا چەندساڵ پێشتر نەخۆشخانەیان ساز کردبا...

# شه‌هید

نافیع عه‌لایی

سه‌رکه‌وتن ئه‌با سوژده له‌به‌ر خاکی به‌ری پێت
هه‌رکوو تۆ هه‌ڵاتی هه‌موو ئه‌ستێره‌یه‌ک هه‌ڵدێت
به‌رگ وجلی گوڵ پاره له چه‌ن لاوه دڕاوه
هه‌رزانی که ره‌نگی روخی تۆ خوێنه رژاوه
بۆی بادی به‌یان خۆشه له‌به‌ر تۆیه به بۆیه
گه‌ر ناوی وه‌فا خۆشه له‌به‌ر عه‌هدی ئه‌تۆیه
ئه‌و ده‌نگ ونه‌وایه که له‌ده‌م تۆوه وه‌ده‌ردێ
تائێسته نه‌بیسراوه له‌ده‌م بولبولی هه‌ردێ
تائێسته نه‌بینراوه له‌نێو غونچه گوڵاندا
یه‌ک گوڵ وه‌کوو تۆجوان وپه‌سندبێ له دڵاندا
تۆ نه‌جمه‌یی سه‌رشانی خه‌باتیت و به نووری
بۆ گرتنی ئامانجه له گیانیشت ئه‌بووری
پڕشنگی چرای عیشقی ئه‌تۆ ره‌نگه به ره‌نگه
رووناکی ده‌ری په‌رده دزێوی شه‌وه‌زه‌نگه
به‌یداخی به‌خوێن سوورته وا رێبه‌ره بۆمان
ره‌نگی فه‌له‌قی ژینی که‌وا روون که‌ره بۆمان
ره‌نگینه چ نه‌خشینه موباره‌ک بێ له باڵات
ره‌نگی سپی و خوێنی گه‌شی ره‌ش به سکاڵات
مردن که به رووسووری یه‌وه، خۆشه! ژیانه !
مه‌رگێ که وه‌ها بێ سه‌به‌بی به‌رزی گیانه

# خۆزگه

عه‌لی ئانه‌وازاده

خۆزگه شاعیر !
شیعره‌که‌ی تۆ
هه‌ر له‌به‌ندی دێر وکاغه‌زدا نه‌مابا
خۆزگه شیعرت
دارده‌ستی پیری ماندووبا
که‌ند و له‌ندی رێی ژیانی
پێ بڕیبا .

*　　*　　*

خۆزگه شاعیر !
شیعره‌که‌ی تۆ
هه‌ر له‌به‌ندی دێر وکاغه‌زدا نه‌مابا
خۆزگه شیعرت
کووژه‌که‌ی بێشکه‌ی منالان با
خرمه خرمی ،
ئالی زه‌نگی پێ ره‌ویبا .

# من چبکه‌م

که له لاتم وه‌کوو زێی سکلێ ره‌وان بم چبکه‌م
دوور له‌تۆ ،گیانی هه‌موو زینده‌خه‌وان بم چبکه‌م

له شنه‌ی باوه‌یه دار سه‌روی ره‌وان و شۆخه
سروه ئاخی تۆ نه‌بێ،سه‌روی زه‌مان بم چیکه‌م

پشتی تۆ کۆم ومنیش تیری‌به‌ره‌و جه‌رگی خه‌نیم
به ده‌س و برده‌وه بێ ماڵی که‌وان بم،چبکه‌م

سواری مه‌یدانی شه‌ڕانخێو و به‌بێ ئه‌زموونم
بێ گوڕه‌ی تۆ که سواری بده‌وان بم چبکه‌م

که‌و که‌ویی نابن و داوناسه هه‌مووی ئه‌وڕۆکه
داوی وردی تۆ نه‌بێ ،بازی که‌وان بم، چبکه‌م

وه‌خته شێت بم له‌سوێی شۆخێ به ناڵه ده‌یگوت :
" دوور له‌دیده‌ونه‌زه‌ری سه‌روی ردوان بم چبکه‌م

پێشڕه‌وی خێڵی برین ،پێشکه‌وه بۆژوانی ئه‌وین
رێی ژوان رژده ،نه‌بی ،تازه جه‌وان بم چبکه‌م

جه‌عفه‌ر شێخه‌لیسلامی

## خەمی شیعر

فاخر روستایی

دەڵێن :
شیعر زادەی خەمە
ئیلهامی خوای عالەمە
زادەی ئێشە
زادەی دڵی پڕ لەسۆزە
زادەی ژانە
زادەی ئەوینی نەورۆزە
تیشکە
لەگەڵ سەردەردێنێ
گڕە
زولم ئەسووتێنێ
ئاوازە
ژەنگی خەمی دڵ ئەسڕێنێ
کەچی !
منی زار و هەزار
منی ژین زۆر تاڵتر
منی کەنەفت
جەستە خەستە
ژین سەختتر لەوەی ژین سەختە
منی سەرسام لەم ژیانە
منی خاوەن هەرچی ژانە
منی شەیدای ژینی بێ وەی
منی کز وەکوو نووزەی نەی
منی بێ ڕێ، بێ جێ، هەتیو
منی کۆیلە، کڕ، داتەپیو
منی
نەمدی، خەم و خەفەت
هەزار ژانی خوای پەند و مەبەست
پەیامی ژین
ناسۆری ئەوین
ژانی بەکۆرپەی هەڵبێنێ
چاو خەوالووم مندا
شیعری گەرمی هەڵیسێنێ
لەباوەشی گران
خەوی
لە

## پاییز

عەلی تاهیری

هاتەوە فەسڵی خەزان و هەڵوەرین
هاتەوە ئەورۆژە بولبول بێ حەزین
زەرد وبێ تینن گوڵانی سوور و شین
دێ تەوژمی ساردی زریانی بەقین
وەختی جووتی کاکی وەرزێر هاتەوە
تێدەکۆشێ تاکوو شێوی کاتەوە

* * *

گێژەڵووکە کەوتە نێو دەشت وزەوی
پێکی دادا پۆپی سەر دار ودەوی
دارە کڕنۆشێ دەبات و سەر نەوی
نایە دەنگی مەل، نیەقاسپەی کەوی
وەختی جووتی کاکی وەرزێر هاتەوە
تێدەکۆشی تاکوو شێوی کاتەوە

* *

چۆلە جێ دەشت وهەوار وبەر نسار
ڕەنجی کێشا کاکی جووتێری هەژار
حاسڵی هەڵگرتووە نەیماوە کار
قایم و خۆڕاگرە، چاتر لە پار
وەختی جووتی کاکی وەرزێڕ هاتەوە
تێدەکۆشی تاکوو شێوی کاتەوە

* * *

## شاعیر و دێ

ک.د.ئازاد

لێم دەپرسێ
بۆ چوویە دێ ؟
هەستی ناسکی شاعیر لەکوێ
ژینی سەختی لادێ لەکوێ
ڕاستە ئازیز
ژینی لادێ یەکجار سەختە
بەتایبەتی بۆ شاعیرێ
کە لێقەوماو و بەدبەختە
تا لەشار بووم
بۆنی نمی کۆڵانی شار ، ئەی نەشمیلانە
لە لای من بەقێزتر بوون
لە بۆنی مردووشۆرخانە
ئێستا لە دێ
هەموو شەوێ دەمخەوێنێ
شمشاڵی شوان
بەیانی زوو
بولبولێ دێ
هەڵمدەستێنێ

لە سروەی ژمارە نۆدا باسێکی (بە ناو ئەدەبی) نووسراوە بەناوی **سەربەخۆیی فەرهەنگی .**

بە چاوپێکەوتنی سەردێڕ* وناونیشانی وتارەکە دەستەوبەجێ ئاسۆی بیری مرۆڤ زۆر لاوازە و هیچ چەشنە بۆچوونێکی زانستی تێدا نابیندرێ وروون نەبۆتەوە کە نووسەر دەیەوێ لەچی بدوێ .

بەرجی لەبەرچاو گرتنی ئەوهۆیانەش کە نووسەر هیچ شی کردنەوەیەکی لەوان

دەکرێتەوە و بەرەو دووردەست دەروانێ کە بەراستی "سەربەخۆیی" ئەم وشە گەورەو پیرۆزە چیە؟ چۆن وەدی دێ ؟ ئەویش لە بوارێکی وا گرینگ و بەرفرەدا !

بۆیە بەلەز* هانا دەباتە بەرهەزاران ئامێر و ئامراز و کەرەسە و هەگەرێ کە دەبنە هەوێنی سەربەخۆیی یا لەنێو چوونی سەربەخۆیی .فەرهەنگی ، بیر لەو ئامێرە مادی و فەرهەنگی یانە دەکاتەوە کە بەپێی بارودۆخی تایبەتی ژیانی کۆمەڵایەتی و شێوازی ئابووری سەربەخۆیی پێک دێنن. بەڵام بەداخەوە وتاری ناوبراو بەدەستەوە نەداوە، لە روانگەیەکی زانستیشەوە نەیڕوانیوەتە مەسەلەکەو وەک ئەوە داواکار بێ ومافی بە گەردنی هەموانەوە هەبێ هەڵدەکوتێتە سەرشاعیرانی مەزنی کورد. کە شاعیری وەک نالی تاوانبار دەکا کە هیچ خولقاندنێکی سەربەخۆ ی نەبووە و لە چوارچێوەی ، ئەدەبی عەرەب و فارسدا گیرساوە ! تەنانەت کارەکانیشی بە وەرگێرانێکی راستەوخۆ لە ئەدەبی فارس و عەرەب دەزانێ .

نازانم نووسەری ناوبراو بۆچی بیری

بۆ ئەوە نەچووە کە پێوەندی گەلان
دەبێتە هۆی تێکەڵاوی فەرهەنگی و
ڕەنگدانەوەی فەرهەنگەکەیان لە یەکدیدا.
بەتایبەتی ئەگەر ئەم پێوەندی یە زۆر
نزیک بێ وەک پێوەندی کورد و فارس و
تورک و عەرەب !

خۆ گەلی کورد ناتوانی لەڕکەی
تەنیاییدا بژی! بۆدابین کردنی پێویستی -
یەکانی ژیان دەبێ لەگەڵ گەلانی دونیا
پێوەندی بگرێ. ئەم پێوەندی یانە خۆیان
هەڵگری فەرهەنگی گەلانن بۆ نێو گەلی
کورد، وەک کورد هەڵگری فەرهەنگەکەیەتی
بۆ نێو گەلی دیکە. مەگەر گەلانی دیکەی
جیهان لە فەرهەنگیاندا ڕەنگدانەوەی
فەرهەنگی گەلێکی دیکە نابیندرێ ؟

بریا نووسەر ـ سەیرێکی شیعری شاعیری
فارس ئەحمەدی شاملووی کردبایە
جا بۆی دەردەکەوت چۆن لەزۆر شوێندا
ڕاستەوخۆو لە زۆر شوێندا ناڕاستەوخۆ
کارەکانی پۆل ئەلوار و مایاکۆفسکی لە
شوێنەوارەکەیدا ڕەنگی داوەتەوە!

ئەمە لە لایەک ،لە لایەکی دیکەشەوە
بۆچما شێوازی شاعیری تایبەتی گەلێکەو
تەنیا بەهۆی بیرو کاری نووسەرێکەوە
دەخولقێ؟ یا بەروبووی بارودۆخ و هەل و
مەرجێکی تایبەتی یە لەژیانی کۆمەڵایەتی
و ئابووریدا ؟ و ئەم ئاڵ و گۆڕەی
لە قۆناغەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و
ئابووریدا ڕوو دەدا ڕاستەوخۆ کار
دەکاتە سەر شێوەی بیرکردنەوە و پێک
هاتنی ڕێبازی فەرهەنگی

ئەگەر نووسەری وتار تا ئێستا لە
بارەی ڕێبازە ئەدەبی یەکانەوە هیچی
نەخوێندۆتەوە و یا ئاگاداری کەمە
واباش بوو بۆ نووسینی وتارەکەی سەیرێکی
تەوانی کردبایە تا زانیبای چۆن وکەی
پێک هاتووە. ڕێبازی کلاسیک و ڕۆمانی
و ریالیزم چۆن ساز بوون ؟

هەڵبەت شی کردنەوە و دوان لەسەر
ئەوان باسان لە وتاری ئێمەدا ناگونجێ
و زۆری بە بەرەوە دەنا بارودۆخی
خولقانی ڕێبازەکانی ئەدەبیم شی دەکردەوە

نووسەر دەڵێ " ئەگەر گەلێک داوای
قەوارەی سیاسی خۆی بکا داوای لێدەکەن
زمان و فەرهەنگەکەی بێنێتە گۆڕ و چ
بەرهەمێکی ئەدەبی و فەرهەنگی هەیە
بیخاتە ڕوو. ئەگەر ئینگلیزی بێ دەڵێ

من خاوەنی ئۆتێللۆم ئەگەر عەرەب بێ
دیوانێکی ئەحمەد شەوقی بەدەستەوەدەدا ".

نازانم نووسەر دەیەوێ بڵێ چی ؟
ئایا ئەوە چووک لەقەڵەمدان و تواند-
نەوەی قەوارەی گەلی کورد نیە؟

ئەم خۆ چووک کردنەوە بە درێژایی
مێژوو، ئێمەی کەمبڕست وبێ دەستەڵات،
کردووە وکەممایەی بە جیهان نواندووین.

پێموایە نووسەر دەیەوێ بڵێ ئێمەی
کورد زمان ، فەرهەنگ و کەلەپوورمان
نیە ؟! ئەدی نازانێ ئەگەر کابرا کورد
بوو خێرا دیوانەکەی نالی دەداتێ و
تاریک و ڕوونی ماموستا هێمنی بۆ
دەخوێنێتەوە و نامیلکەکەی پەشێوی
دەداتێ و سەرنجی بۆ شیعرەکانی شێرکۆ

رادەکێشی ؟ خەرمانی زانست و ناسینی مەحوی و فەقێ تەیران و خانی و کوردی وجریری و هەزار نووسەر و شاعیری دیکەی کوردی بۆ بەشەن دەکا....

دیسان نووسەر دەڵێ :

**لەوە لاف و گەزافتر نیە کە خۆمان بە گەل بزانین و خاوەنی کەسەتی ئەدەبی نەبین .**

بۆ مەگەر ئەم هەموو شاعیرونووسەرو بەرهەمەکانیان فەرهەنگ وئەدەبی کوردی نین و نابنە نیشانەی کەسەتی فەرهەنگی؟

لەو وتارەدا شاکاری ئۆتێللۆودیوانی ئەحمەد شەوقی پێناسی قەوارەی سیاسین. بەڵام نووسەر و شاعیری زۆر، بەبەرهەمی شاکاریانەوە لە کوردیدا نیشانەی سەربەخۆیی فەرهەنگی کورد نین؟! سەیرە !!

زۆر سپاسی نووسەر دەکەم ئەگەر ئەم مەبەستەم بۆ روون بکاتەوە !

نووسەر پێی وایە دەبێ شێوازی ئەدەبی کوردی لە هەموو گەلانی دیکەی جیهان هەڵبڕی و جیاواز بێ بەڵام نەینووسیوە ئەم رێبازە دەبێ چ بێ کە نووسەران و شاعیرانی کورد پێی دابڕۆن. بۆچی لە پەردەدا قسە دەکا؟ ئەوە چ راز و نهێنی یەکە کە نووسەر دەیەوێ کورد لە گەلانی جیهان جیا بکاتەوە؟

نووسەر دوو خاڵی سەرەکی بۆخۆی دیاری دەکا و بە مەرجی ناساندنی ئەدەبی کوردیان دەزانێ. **فۆلکلۆر و وەرگێران** ! سەیرە نازانم ؟ ئەری هیچ شک لەوەدا هەیە کە ئەدەبی دایک و ماکەی فەرهەنگی هەر گەلێک فۆلکلۆری ئەو گەلەیە ؟ مەگەر فۆلکلۆر خۆی ئەدەبی نووسراو نیە؟ ئایا بایەخ دان بە فۆلکلۆر کە ئەرکی سەرشانی هەموو نووسەرانی گەلە نابێتە هۆی تاوانبار کردنی ئەوان بەم تاوانە کە دەستیان

لەسەر دەست داناوە و لە تێشووی رابردوو دەخۆن ؟ هیوادارم وانەبێ !

نووسەر حەزی لە خولقانە بەڵام هیچ رێگایەک نیشان نادا وبەردەوام درێژە بەوە دەدا کە دەبێ نووسەرانی کورد باو و خدە وئەفسانەی هەزار ساڵ لەمەو بەری کورد زیندوو بکەنەوە و بڵێن ئێمە لە رابردوودا ئەوە بووین! ئەدی ئێستا چمان هەیە و چین ؟ ئەرێ بەمە دەڵێن خولقاندن ؟

ئایا نووسەری ناوبراو لەچ دەگەڕێ بۆ راستەوخۆ قسەی خۆی ناکا. بۆ دەیەوێ گەلی کورد بگێڕێتەوە بۆ هەزار ساڵ لەمەوبەر و لە چوارچێوەی ئەم بیرو بڕوا کۆنانەدا رایگری؟

مەگەر نازانێ ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری ئاڵ و گۆڕی بەسەر دادێ وبەسەریدا هاتووە ؟ یا پێ بەپێی ئەم ئاڵ وگۆڕانە سنعەت و زانست پەرەی گرتووە و راستەوخۆ شوێنی لەسەر بیرو رای گەلی کورد داناوە ؟

لە لایەکی دیکە نووسەری وتار دوای ئەم هەموو هاوارە کە بەقسەی خۆی بۆ سەربەخۆیی فەرهەنگی کورد دەیکا دەڵێ ئەوە شەرت نیە کە دیمەنی ئەدەبی کوردی زمانی کوردی بێت . ئەم هەموو واتە

دژ بە یەکانە چن ؟ ئاخر چۆن پێناسی گەل زمانیەتی بەڵام مەرج نیە روخساری ئەدەبی بێ ؟

ئەمجار نووسەر نەتیجە لە قسەکانی وەردەگرێ و روو دەکاتەوە نووسەران و شاعیرانی کورد و دەڵێ :

**من ناڵێم ئەدەبەکەمان ناتەواوە بەڵام کتێبخانەکەمان هەژارە و لاساییان زۆرە و پەلە دەکەین .**

نازانم مەبەستی لە پەلە کردن چیە ئایا ئەو تۆزە جووڵانەوەیە بە پەلە دەزانێ کە بە هەزار ئەڵڵا وەڵڵا وماشەڵڵا دەکرێ ؟ یا دەربڕینی هەست و نەستی نووسەرانی کورد بەپەلە دەزانێ کە لە قووڵایی دەردی گەلەوە هەڵدەقوڵێ ؟

لە کۆتاییدا دەڵێ :

**ئێمە کارمان زۆر کردووە** (سەرەڕای ئەمە دەیگوت "پێناسمان نیە") دواقسەی خۆی وا دەردەبڕێ :

**دەبێ بزووتنەوەی وەرگێران زۆر گەشە بکا تا دەبینە خاوەنی کەسەتی وقەوارەی سەربەخۆی فەرهەنگی .**

بێ شک دەبێ وەرگێران گەشە بکا و پێویستە . بەڵام ئایا ئەوەیە سەربەخۆیی فەرهەنگی ؟

ئەدی ئەو سەربەخۆیی یەی کە نووسەر سینگی بۆ دەکوتا چی لێهات ؟

ئەو هەموو مێژووەی کورد کە بە فارسی و عەرەبی و تورکی و گەلێک زمانی دیکەی دنیا وەرگەڕاوە ونووسراوە کاری وەرگێران و ناساندن نیە؟ ئایا ئەو بزووتنەوە کە وەرگێران ونووسەران لە جیهاندا لە گۆڕێدایە ولە وڵاتانی ئەمریکا و ئوروپاو.... هەیە کاری ناساندنی کورد ناکەن ؟ نازانم بۆ نووسەر باسی ئەوانەی نەکردووە؟

هیوادارم خوێنەران و نووسەرانی سروە ئاوڕێک لە **سەربەخۆیی فەرهەنگی** بدەنەوە و لێی ورد بنەوە تا سەربەخۆیی فەرهەنگی لەم چەند دێرە دژ بەیەکەدا کۆ نەبێتەوە و پێشینیان گوتەنی نەبێتە **"ناوی زل و دێی وێران"!**

# خانە خەوێ..!

پەرویز جیهانی

وەتی وەبیرم دێ هەر کرێگرتە بوومە و ماڵم بە کۆڵەوە بووە. منداڵی ورد لە لایەک و پرتەوبۆڵەی خاوەن ماڵ لە لایەک بووەتە هۆی ئەوە هەر رۆژە لەدەرکێک بم و وەک پشیلە فەرخەکانم بەددانەوە بێ .

دۆست وئاسیاو* لەفکرم دان و هەریەکە چارەیەکم بۆ دەدوزێتەوە. ئەگەر قسە لە قسە کەوت دەڵێن وەکی " فلان کەسی لێهاتووە قەت لەجێگایەک ئۆقرە ناگرێ".

یەک لەو دۆستە خۆشەویستانەم رۆژێک لەنێو قسەدا گوتی :

- برالەبۆ خانوویەک بۆخۆت ناکری ؟

- کابرا بەچی بکرم. کوا پوول ؟ ئاخر دەڵێی لەم عەسر وزەمانەدا ناژی کارمەند وخانوو !؟

- ماڵتە خۆ حوکم نیە لە نێوەراستی شاردا بکرێ. وەک زۆربەی کارمەندەکان پەنا بەرە بەر گوندێکی قەراغ شار وخانوویەکی هەرزان بکرە !

ئەوە بۆمباران دەستی پێکردووە. خاوەن ماڵ کونە مشکیان لێ بووە بەقەیسەری خانووبەرەی چوارنهوم بە کاول و تەویلەی گوند دەگۆڕنەوە. کورە دەغیلت بم هەلە وهەڵکەوتووە لە دەستی مەدە!

ئەوەندە دە مێشکی سریواندم هەتا مەجبووری کردم بڵێم باش !

حەول ودەول دەستی پێکرد.چەند رۆژان وێگرا چووینە گوندەکانی نیزیک شار. تا رۆژێک خانوویەکی فرۆشیاریمان وەدەستکەوت کابرای بونگاچی دەیگوت :

- بریا پوولم هەبا خۆم دەمکرێ. جا هەر من دەزانم چ خانوویەکە ! قەسریش تای ناکا. کابرا قەرزدارە و دەیفرۆشی . هەڵبەت دەبێ بڵێی لەئاوی دەکا. بەخۆڕایی یە.

ئەگەر هێندێکی دیکەی پێهەلگوتبا لەخۆشیان شاگەشکە دەبووم. هەر ئەوەندە "باشە"م لەلێو دەرپەڕی، ناردیان بەدووی کابرادا و هات .

کارم بەوە نیە ئەوەی دیتم لەگەڵ ئەوەی باسیان کردبوو چەندی نێوان بۆو بەڵام خۆ هەژار مافی هەڵبژاردنی نیە.کۆختەیەک بوو و منداڵم تێدا دەشاردەوە، دیسانیش شوکری خودا کە لە کرێگرتەیی رزگاریم دەهات .

قەولنامە نووسرا و مانگێکم مۆڵەت درا تا بچم پوول ساز کەم وبگوێزمەوە .

بەلەز هاتمەوە ماڵ و دایکی منداڵانم گاز کرد و حاڵیم کرد. ئەویش هیچی نەدەگوت تەنیا لەبیری ئەوەدا بوو کە کرێگرتە نیە وخۆی خانووی هەیە. لە ئەنگوستیلە و بازنە و سکە را بگرە هەتا قاپ و قاچاغ هەمووم حیساب کرد بەڵام بۆ سەمەر بوو. چاوێکم لەئاڵقەی دەستی کرد وبۆ ئەوە هیچ بڵێم کوتی :

- ئەگەر بشمرم ئەوە نادەم.

کچێ خۆمن هیچمنەکوتووە ئەوە دەڵێی چی ؟

خودا خودام بوو وەک خۆم لێ بێتەوە.وردەواڵەو زێڕەکانم هەڵگرت وفرۆشتم دەستم بە راوڕووت* لەخزمو ناسیاوان کرد. پەنام بردە بەر "قرض الحسنه" و بەکورتی کارم جێ بەجێ بوو.پوولم داو گوێزتمەوە.

حەوشەکەمان سەربانی دراوسێی لێوە دیار بوو. هاتبووین وتەنیا بیرمان لەوە دەکردەوە کە خانووی خۆمان هەیە.

رۆژێک منداڵ بەغار هاتنەوە و گوتیان :

- بابە،بابە، تەمەشای سەربانی ئەو ماڵەا

- دەی جا چیەتی ؟

- چۆن چیەتی؟ چاوی لێ بکە .

ئەگەر هەستام دیتم ئەوە خاتوونی دراوسێمان دەوە دەکا و سەربانی پێ رازاندۆتەوەو بە دەستی نەخشاندوویەتی . بۆنی دەوە لە وڵات گەڕا. بە منداڵەکانم گوت :

- رۆڵە سەربانی خۆیەتی، کەیفی خۆیەتی.

پەنجەرەکانم داخست و هاتمەوە ژوور.نەمدەتوانی چ بڵێم. چون کابرا ماڵێ خۆیەتی ودەڵێ بەتۆ چی . یەکەو دوای ئەمەش کار و پیشەی زۆربەی دانیشتوانی ئەم گەڕەکە ئاژەڵداری یە و پیاو لە شاری کوێران دەبێ دەست بە چاوی یەوە بگرێ.

وردە، وردە بە بۆنی شیاکە* راهاتبووین ودەنگمان نەدەکرد. بەڵام گەرما دا- هاتبوو.بە هاتنی هاوین پیلان دژی منی چارەرەش ، دەستی پێکرد و مێش و مێشوولە هەراسیان پێ هەڵگرتین .

دراوسێ بۆ خەموخەیاڵەکەشمان دەوەی وشکی لە سووچی حەوشەکەی خۆی لە قەلاغ دەدا وئی تازەی ساز دەکرد دراوسێ بە دانانی قەڵاغ " دەست درێژی سنووری " کردبوو. قەڵاغ مەکۆی مێش و مەگەز بوو و دەتگوت ئەم قەڵاغە " کۆلکسیونی حەشەراتە"

مانگی گەلاوێژ زۆر گەرم بوو. شەوانە دەبوو لەترسی پەلاماری درندانەی مێشوولە پەنجەرە نەکرێتەوە جا شەوی هاوین و پەنجەرەی داخراو بە قەولی کابرا گوتەنی: لەسەر دونیای روون جەهەننەمم کڕیبوو.مێشوولەی گلادیاتور هەرکە کون و کاژێرێکیان شک دەبرد دەتگوت دوژمنی بابەکوشتە- مانن هێرشیان دێناو کەوڵیان دەکردین.

منداڵی بەستەزمان دەستیان دەکرد بە شەڕناخێوی و مێشوولەیان دەردەکرد.

شەوانە کارمان "کەمین" و مین دانانەوە بوو.سەنگەر و مەتەرێز بەندیمان کردبوو. تا تەک وپاتەکی دوژمن دەفع بکەین و بەرپەرچی هێرشەکانی بدەینەوە.

مێشوولەش ئەوەندە بێ دەسەڵات نەبوون لەکەلێنی دیوارەوە دەچوون وبە بەری میچەوە دەنووسان .لەکاتی دیاری کراودا سەنگەریان چۆڵ دەکرد ودیدەبان هەواڵی وچانی ئێمەی پێدەدان و ئەوانیش هێرشیان دێنا.... شەڕ ساز دەبوو شەڕێک کە کەوچکی تێ نەدەگەڕا.

دەنگی سریلە وویزەی مێشوولە وهازەی مێش سەمفۆنی بەخۆڕایی ئێمە بوو ولینگەفرتەی منداڵە وردکە ویدئوی ماڵێ کارمەند

بوو .

ڕۆژێک غیرەتم وەبەرخۆ ناو چوومە ماڵی دراوسێ و عەرزم کرد:

– برالە "دەوە"هەراسی بەگیانی هەڵگرتووین و تەنگی پێ چنیوین.ڕێگایەک چارەیەک ؟

کابرا لەپێشدا دەستی بە زگی گرت ولە قاقای پێکەنینی دا . ئەوەندە بە ئیشتیا پێدەکەنی منیش پێکەنینم هات وهەردووکمان وێکرا لە قاقامان دەدا . شاق* نەماندەزانی بە چی پێدەکەنین ....

هەتا لەپڕ ئەو بێدەنگ بوو .کەمێکی خۆ هەڵمساندو زۆر بەتووڕەیی گوتی:

– نەمدەزانی جەنابت شارەیی و داری گەنمت نەدیوە .کوڕە ئەوە دەڵێی چی؟! سەربانی ماڵی خۆمە هەروەخت ئەوکارەمان لەسەر بانی تۆکرد گلەیی بکە .

لارەمل گەڕامەوە. نێو بژی* کردن بێفایدە بوو. دەبوو پیلانی نوێ بگێرم و بۆ کرینی چەک دژی دوژمنی هێرش هێناو کالەی ئاسن هەڵبەستم .لەبازار دەرمانی مێشوولە وەگیر ناکەوێ . ئەگەر هەبێ زۆر گرانە و بەئێمەمانان ناکرێ. ئەوە بوو بە خەون و خەیاڵم وەک ژنراڵی قەدیم پەنام بردە بەر کۆنە

کتێبی شەڕ. لە نەکاو گزەی کۆنەسەربازێکم وەبەر چاو کەوت لەشەڕی دووهەمی جیهانیدا کە مەیدانی مین وتەیمانی* ساز کردبوو...... بەڵێ بۆخۆیەتی تۆڕ ...... تۆڕی پەنجەرە...... ئەوجار

لەخۆشیان شاگەشکە بووم.

بەیانی بەرەو بازار وەڕێ کەوتم تا ئەگەر دەرمانی شیمیایی وەدەست نەکەوێ تەیمان ساز بکەم. بەڵام نرخی تۆڕ ئەوەندە گران بوو سەرم ماسی. دە ڕۆژی بۆ حقووق مابوو. پووڵی نانی وشکم لە گیرفاندا بوو. کوتم:

قەیدی نیە بەس نیە تیکرو تەسەل دەنووم باتێر و تەسەل نەخۆم.

دوو گەزم تۆڕ کڕی و بەلەز خۆم گەیاندەوە ماڵ تۆڕم لەپەنجەرەی وەتاغێک دا وبۆ یەکەم جار لە ماوەی خەباتی دژی مێشوولە وێرام پەنجەرە ئاوەڵا بکەم شنە بای شەو بەسپایی

خۆی لە ژوور دەخزاند ئیدی هەم کولێرم هەبوو هەم لە پاتەکی دوژمن نەدەترسام. بەڵام هێندەی نەخایاند دوژمن زۆر لە من وریاتر بوو. هەرکە چرای وەتاغ. گرا، میشوولە

هێرشیان هێنا و مەتەریزی نوێیان گرت . ئەوانی درشت لەپشت تۆڕەکە بوون و ئەوانی ورد هاتبوونە ژوور .

شەیپوری شەڕ لێدرا دەتگوت دابێژراون، سەت خۆزگە بەمێشوولە گەورەکان ئەوانی وردەڵە هێند تامەزرۆی خوێن بوون بە هەر جێگەیەکەوە دەنووسان قورتمی وایان دادەگرت دەتگوت برسی ساڵی ڕەواین ئەوانی دیکەش یە ویزە ویز نەترە*یان وەبەر دەنان و "موهیمات"یان بۆدەناردن وردەڵەکان بە چاو نەدەبیندران.ئەوانی درشت زووتر دەردەکران. خێزانم دەسرەیەکی بەدەستەوە دەگرت

و هەڵیدەسووراند بەڵام
مێشوولە وەتۆڕ دەکەوتن و
رێی دەربازبوونیان نەبوو.
تا نیوەشەو شەڕدرێژەی
بوو. پاکسازی بەرە بەرەی
بەیان تەواو بوو. ئەوەی
کوژرا و بریندار بوو،دەنا
بە کەلێن و کولێندا
وەدەرکەوتن .
دوژمن بە سەر و سەکوتی
خوێناوی وئێمە بە لەشی
هەڵمساو کۆتاییمان بەشەڕ
هێنا .
سەربازەکانی شەکەتی
من هێزیان لەبەردانەمابوو
پێویستی یان بە مورەخەسی
بوو. ئیزنم دان وچانێک
بدەن. زامارەکان دەرمان
بکەن و وچان بدەن.
شوێنەواری شەڕ لەسەرو
دەم وچاومان دیار بوو
هەموو لەشمان شین و رەش
هەڵگەڕابوو.ئەو رۆژە لە
شەرمان نەمتوانی بچمەوە
ئیدارە و لەماڵ مامەوە.
بریارمدا خانوو بفرۆشم
هەر موشتەری یەک کەدەهات
چاوی بەشوورەی قەڵاغ دەکە ـ

وت پەژیوان دەبۆوە
تازە بەزەبری گورچوو
بڕی مێشولە راهاتبووین
بەڵام هەرکە میوانێکمان
دەهات وجینگڵی دەدا لە
شەرمان دەبوومە تنۆکە
ئاوێک ودەچووم لەعەرزەوە.
جارێ چارەم نیە. وام لێ
بەسەر هاتووە کە بڵێم
سەت رەحمەت بە زەمانی
کرێگرتەییم. بە کوردی
کارمەندم. کارمەندیش بەرجی
ئەوە کە بسووچێ وبسآچێ
چی لەدەست نایە !

فۆڕمی شابوونمان
شمارە
ناو..........شۆرەت..........دانیشتووی..........
......تمەنم بەحیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی رزمیێ گرت و
فیشەکەم وتیرای ئەم بەرگە بۆ نادرن. لەژمارە.......را هەتا......گۆواری سروەم.
بۆ بەرێ بکەن.
ناونیشان..........
..........

# ڕێنوێنی ئەدەبی

سەردەشت :**بەختیار حەسەنی**

شیعری شین گێڕی،
سەردەشت لاوازە زۆری کەم و
کووڕی لەباری ماناوقافیە
ـ وە هەیە
وەک :
**قەسەم بەوکەسی کەشیمیایی**
**کرا .**
**دوائەوەی کەئەودونیایی**
**کرا .**
**هاوشاری ئەمن هەمووبەراستن**
**لەپێش چاوتان وەکووکەراستن**
**پووش پەڕین ئەوا روحی**
**حالەمان**
**وەکووپووش وەرین چوونە**
**ئاسمان ....**
وشەی پووچ وکۆچ نانبەقافیە
ڕۆژی ئەبەدبۆمانگی ئەبایە
بۆشەهید مەلەک هاتنەتکایە

بەبڕوای ئێمە قەڵەمەکە
ـت لەرێبازێکی دیکەی
ئەدەبیدا وەکارنجەیخزمەتێکی
پتردەتوانی بەفەرهەنگ و
ئەدەبی گەلەکەت بکەی
هەروەک ئەمسووژەیەت کردبا
کورتە چیروکێک یا ،
پەخشانێک زۆرلەمەجوانتر
دەبوو .

ئیسفەهان: **ڕەشید ئەحمەدی**

برای خۆشەویست بەبڕوای
ئێمە بابەتێکی دیکەی ئەدەبی
جگە لە شیعر بگری باشتر
دەتوانی بنووسی.چون ئەوەی
بەناوی شیعر بۆت ناردووین
ئەم راستی یە پێشان دەدا
کە لەباری وەزن و قافیەوە
نارێکن وماناشیان نیە.وەک
قەترە چاوەکەت وەک

هەوری بەهار
دەرمانی دەردە لە
کێوو هەوار
سۆزەبای زریانە لە
گەڵای دار
وێران ئەکا دڵی گشت
دێهاتی وشار
قەترەچاوەکەت شەونمە
لەتۆڵ ؟
گەشاوە دەکا بەهارم
لەدڵ
ئێش وژانی دڵ هەموو
کات بەکوڵ
بڕژێنە سەر شاری
بەرزی دڵ
چاوەڕوانی کاری ئەدەبی
باشتری ئێوەی بەڕێزین .

بۆکان: **ئەنوەر جەنگەلی**

ئێمە لەماناومەبەستی

---

**چون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروزووری وڵات بە نامەی جوان ورازاوە داوای "فۆرمی ئابوونمان"یان کردووە، ئەوە جۆنەتی ئابوونمان لە دەروزووری وڵات بەو شێوە رادەگەیەنین**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆنێو خۆی وڵات | ٢٠٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ وڵاتە دراوسێکان | ٣٨٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆ هیند وئورووپا | ٤٢٠ | تمەن |
| نرخی | ١٢ | ژمارە بۆئامریکا وخاوەری دوور | ٥٠٠ | تمەن |

**ناونیشان : اورمیە ـ صندوق پستی ٧١٧ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ٠٣٥٨٠٠**

**بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستگاکانی دەرەوە دەخوێنن ( ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن ) هەل و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت بێ بگا .**

ئەم شیعرە نەگەیشتین تا
نەزەری خوێنەران چ بێ ؟
کوێستانی سەر چیا
بەرزەکان
تاوەکەوا هاتە
عەقدی سورەییا
هەرخاوەن دڵ دەزانی
چی چوە دەڵ
بۆیەهەرنا مەنووس زانی
ئەنوەر نووسرا
مەهاباد: **فایق رەشیدزادە**

بەبڕوای دەستەی نووسەران خۆ بە شیعرەوە خەریک مەکە ئەوە شیعر نین .

گەرچی ناڕاحتم سووتاوە
هەناوم
بەڵام هەرشوکرا نەبڕێری
پەروەردەگارم .

بۆکان: **سەیدکەماڵ لەتیفی**

نووسیوتە شیعرەکەم رەخنەی بێ جێی لێ گیراوە بەڵام دەبێ پێت رابگەیەنین ئەگەر دەستەی نووسەران،شیعر یا بابەتێکی دیکەی ئەدەبی بە لاواز زانی نیشانەی دوژمنایەتی نیە بەڵکوو بە بڕوای ئێمە ئەگەر رەخنە نەبێ نە نووسەر نووسەرە و نە خوێنەر کەڵکی پێویست لە نووسراوەیەک وەردەگرێ.

ئێمە دەڵێین شیعرەکەت لەباری وەزنەوە کەموکووڕی هەیە دەفەرمووی نا ! ئەوە چەندتڕلە شیعرەکەت چاپ دەکەین تا خوێنەرانی بەرێز هەڵی سەنگێنن وڕای لەسەر بدەن.

لەدڵما کەنووری"حی البشر"
دابێ
بەکوردی من دەکەمتەوافی
هەردابێ
بەڵام نەک وێنەیی یەک
عەنتەرێ....
لە سوورو گێژەوی هەر
گۆموگەردابێ
ئەمن نیم بارەبەر بۆهیچ
مڕوموچێ
تەنانەت مست وشەق گەربێ
و بەسەردابێ
بەتەنیا رێی تەڕڕەققی
تۆ سەوادە
با بەسەواد جێت لەکۆمەڵێ
حوڕ دابێ....

سەقز:
**شەهلاحەسەن نژاد**

شیعرەکەت کەموکووڕی زۆرە و بۆچاپ نابێ.

وشەی **تۆدا ،حەسرەتدا ،نێودڵلا نەکاودا ، لێدا ، پێشدا ، ئا**نبەقافیەلەباری ، وەزنیشەوەلەنگە وەک:

**دەمێک بوومەلەوان بووومن**
**لەدەریای فیکری تۆدا**
**شەکەت بووم خۆئەوەندەی**
**دەست وپێم لێدا**

مەهاباد: **عادڵ عەباسی**

نووسیوتە هیندێکم مەتەڵ هەیە. دەتوانی ئەم مەتەڵانە بۆ ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی بنێری تا دەستەی نووسەران رای لەسەر بدا

هەوشار: **عومەر مەولوودی**

چیروکەکەت گەیشت . یەکجار جوان وبەرێوجی یە بەڵام زۆر درێژەو بەداخەوە نەمانتوانی لە سرووەدا بیگونجێنین . دەتوانن چیرۆکی کورت بەم قەڵەمە جوانەتان بنووسن وبۆمانی بنێرن .

هەڵبەت ئەوەشمان لەبەر چاوە کە ئەم نووسراوە و چیرۆک وبابەتانەی لە گۆواردا ناگونجین (ئەگەر بۆمان بلوێ) بە ناوی هونەری لاوان بە شێوەی کتێب لە چاپی بدەین .

شیعری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە. زۆر لاواز و کەم هێزن بەبڕوای دەستەی نووسەرانی سروە ئەم خۆشەویستانە شیعر نەڵێن و خەریکی بابەتێکی دیکەی ئەدەبی بن باشترە .

سەقز: **عەلائەدین محەممەدی**
نەغەدە :**بەدرەدین ئیسقێلی**
شنۆ: **کەریم کەریمپوور**
دێهلۆڕان: **لەتیف قادری**
مەهاباد:**عەلی عەرەبی**
شنۆ:**محەممەد حوسێن پوور**
مەریوان: **عەلی مەحموودی**
بۆکان:**ئەمیر حوسێنی**

# هونەرمەندان

## فەهیم سەرروت

- تکایە خۆت بناسێنە!

- من عەولا تاغی دانیشتووی " سێ بیان"ی شنۆ کوڕی مەلا عەلیم کە خەڵکی خەتایی(چۆمی مەجیدخان) بوو. نیزیک بە شێست ساڵم تەمەنە. دوو کوڕم هەیە ئەڵبەت بەسجیل شۆرەتم رەسووڵی یە.

بیست ساڵە بووم عەلاقەم کەوتە سەر بەیت و بابم مەلا بوو زۆری حەول دا خۆ لەبەیت بپارێزم و وەدوای نەکەوم بەڵام من جحێڵ بووم وەدەنگیشم خۆش بوو نەمدەتوانی دەستی لێ هەڵگرم تا وای لێهات بابم دەری کردموپەڕیوەی هەندەران بووم. چوومە قالوێی مەنگوڕان.چوومە نێو مامەشان، نێو دێبوکری یان هەڵبەت نەک بلێی بەیت وێژیم کردبێ بەپیشە. کاری دیکەم کردووە بەڵام بەیتم هەر گوتووە. هەر کەسیش شتێکی گوتبێ خۆمگەیاندۆتە لای ولێی فێر بووم.

- ئەو بەیتبێژانەی لە هەوەڵەوە بەیتیان لێ فێر بووی کێن ؟

- ئەوانەی من دەمناسین پێموایە هیچیان نەماون یا زۆرپیرن وەک مەجیدی حەسەن بێری خەڵکی کەلبەڕەزاخان(سەرچنار) کە شایەری هەموو دێبۆکریان بوو، مستەفابەگی دایماوی،حوسێن شەشەی سەردەشتی.

- چ بەیتێک دەزانی ؟

- بەیتی لاسی باڵەکان لەیل ومەجرووم ،ئایشەگولێو..

- ئێستاش هەر دەیلێی ؟

- وەڵڵا وەختی خۆی رۆژ بوێرم نەبووە بەڵام ئێستا پیرم وعومرم هاتۆتەخەلاسی ئیدی وازم لێ هێناوە.

- چۆنت عەلاقە بەبەیت پەیدا کرد ؟

- وەکی کوتم کەیفم بە گوتنێ دەهات. بەڵام شەرمم دەکرد. لەبەر بابم لە رووم هەڵنەدەهات بە رەسمی وەدوای بکەوم،دوایە شەرمم شکا وهەرکەس بەیتی زانیبا دەچوومە لای یا بە گوتن لێی فێر دەبووم یا خۆبە دەرس .

-چۆن بەدەرس فێری دەبووی؟

- بەیت بەیت پێیان دەگوتم وئەمنیش لەبەرم

دەکردو ڕەوانم دەکرد .یانی
بەیت بێژ بەندێکی فێر
دەکردم ،سبەینێ لێی دەپرسیمە-
وە ئەگەر ڕەوانم کردبا
بەندێکی دیکەشی فێردەکردم
مەسەلەن بەیتی لاسی باڵەکان
بە سێ مانگ فێر بووم.

— بەیت بێژی دیکە کێ
دەناسی ؟

— مەجیدەگڕۆیی
کەلبەڕەزاخانم دەناسی ،
ڕەحمان مەجیدی برایشیم
دەناسی،سەیدعەولای بورهانیشم
دەناسی وبەیتی لەیل و
مەجرووم لای ئەو فێربووم.

— ئەدی خۆت کێت
فێر کردووە ؟

— ئەوە دەزانم بەیت
خەزێنەی بەوەجی کوردە .دەبێ
بپارێزرێ من زۆرم حەول
داوە کوڕەکانم بەیت فێر
بن بەڵام بەداخەوەهیچیان
عەلاقەیان پێ نیە . لەسەر
ئەوەش را زۆر کەسم فێر
کردوون وپێم‌ڕەوان کردوون.
ئەودەم کە من دەمگوت
نەوارو شتی وا نەبوو.
وەختێک ئەوانە پەیدا بوون
ئیدی من لەدەنگ کەوتم و
تاقەتم بڕاو بۆم‌ناگوترێ.

وەکی لەبیرت بێ تا
ئێستا بەیت بۆ چینێکی
کۆمەڵ گوتووە ؟

— لە مەجلیسی گەورە،
گەوراندا دەمگوت بۆئاغاوەت
و پیاوماقووڵان بەڵام‌وەختێک
پێم‌خۆش بوو بیڵێم کە
هاوشانی خۆم لەدەورەی بێ
زۆرجار دەچوومە دێیەک
و خەڵک دەیانزانی هاتووم
دەوریان دەدام و بە سێ
شەوو چوار شەو بەریان
نەدەدام منیش بۆم دەگوتن.

— تۆ سوارۆ دەزانی؟

— بەڵێ،سوارۆ وئایشە
گوڵ دەزانم .جا دەمەوێ
شتێک روون بکەمەوە کە
خەڵک ڕەنگ بێ تا ئێستا
نەیزانیبێ ئەویش ئەوەیە
کە دوو سوارۆمان هەیە
سوارۆی ئایشەگوڵ چووە بۆ
شەڕی مەغریب زەمینێ جا
ئایشەگوڵ پێی هەڵکوتووە
نەگەڕاوەتەوە بەڵام سوارۆی،
سنجانێ چووە بۆ کاولە
لەحسایە و گەڕاوەتەوە و
سنجان پێی هەڵگوتووە.

لەناوچەی شنۆ کێت
دەناسی ؟

— برایم خەلیلم دەناسی.
خەڵکی نەڵیوان بوو ،بەیتی
شێخ فەرخ وئەرکان وبەیتی
فەقیری دەگوت بەڵام هیچی
لێ فێر نەبووم. برایم
خەلیل برازای میرزاجەلیلی
شنۆیی بوو.

زۆر سپاست دەکەین
و هیواداریـن بەخۆشی عەمر-
ێکی دوورو درێژ رابوێری.

— منیش لە ئێوە
مەمنوونم کە ئەو بەیتانە
ئەو بەیتە پڕقیمەتانە
دەپارێزن. براله سێ چوار
بەیت بێژی پیر ماون و
دوو سێ بەیتان دەزانن
ئەگەر ئەوانیش بمرن حەتمەن
بەیتەکانیش دەگەڵ خۆیان
دەبەنە بن گڵ و ئەو دەم
منداڵی دوارۆژ ڕەنگ بێ
هەر نەزانن بەیت‌چ بووە؟
یا هەر بەیت بێژ هەبووە
ئەمما ئەنگۆ نایەڵن
بفەوتێن وبەرە ، بەرە
زیندوویان دەکەنەوە .ئەمن
بۆخۆم سەوادم نیە بەڵام
بەیتەکانم بۆ دەخوێننەوە
زۆریان تەواو نین ئەوەش
خەتای ئێوە نیە بەڵکوو
بەیت بێژە کەیاهەرئەوەندە
فێر بووە یاپیری لەبیری
بردۆتەوە. لەخودای دەکەم
تەڵەبێ خودا بۆخۆی بتان
پارێزێ .

# شێعر چییە؟

ب. هێڤی

شێعر چییە؟ چ رەنگییە؟ ژبۆی چییە؟
شێعر ژینە ، ژین ڤەژینە ،
دایکا دلا، گشت ئەڤینە ،
شێعر ئەوەک : بلڤینە* ، بهەژینە* ،
بڤەژینە ، ل رێ خینە
بیرو مەژێ* یا ، لناڤ سەری یا
بۆ رزگاری یا ، کۆما مەری یا
ببزڤینە ، ببزڤینە.
سەها مرۆڤ ، بۆرۆناهییێ ،
بپشکینە ، بپشکینە .
شێعر ئەوە تاڤا رۆناک ،
خاوێن وپاک ،ل بن عەورێ،رەش ونەچاک
هەلکشینە ، هەلکشینە .
ئەوێ تاڤێ ، تەڤ خوناڤی ،
ل سۆرگولێ ناڤ ژیانێ ،
بوەشینە ، بوەشینە .
تارستانێ ل ژیانێ ،
راڤەتینە ، راڤەتینە.
شێعر ئەوە ئستەیرکا* ، ل
عەسمانا ، سەر نەزانا ،
هەلوەرینە ، هەلوەرینە .
بێ رازایی ژ، خەو کیژووشکا
هەلپەکینە ، هەلپەکینە .

* * *

شێعر چییە؟ چ رەنگییە؟ ژبۆی چییە؟
شێعر ئەوە، یەک ریچالێ* ، ژ
هالهالێ* ، حەباندنێ ، تەباندنێ ،
گیهاندنێ، هیماندنێ ، لناڤ دلا
دانکینە ، دانکینە .
تریشکەکێ* ژ ئەڤینێ ، دلحەبینێ ،
وەکی گولێ ، لناڤ دلێ دۆست ویارا
بنتلینە ، بنتلینە .
باغێ گولا ، ل سوورملا، مێرگا
دلا ، بۆی بولبولا ،
بگەشینە ، بگەشینە .

* * *

شێعر چییە؟ چ رەنگییە؟ ژبۆی چییە؟
شێعر خینە، لەش بزڤینە، وەکی
کۆرپەی نازەنینە ، دەماچاڤێ دل دبینە
دحەبینە ، دحەبینە .
شێعر دلە ، دقلقلە* ، خوونێ
بۆگشت،تەنشت وپشت ، بنێ پی یا
تا سەری یا
درەشینە ، درەشینە .
شێعر ئەوە دەرگێ دلا بۆی سۆرگولا،
بۆی سۆرگولێ چیا و چلا
وەبکینە ، وەبکینە .
شێعر ئەوە وەک نەینووکێ* ،
ئانخۆدیکی، ئاوێنە یا گشت حەزیکێ،

دلێ مرۆڤ ژین هەژینێ ، بزڤینێ ،
هەمڵڤینێ، شیرینی یا ڤێ ئەڤینێ
تێ ببینە ، تێ ببینە .
شیعر ئەوە، ئاخ هەر وەکی
ئاسن رەڤێن،دلێ تژی خازیک ،
ئەڤین، ل سەر خوەدا
راکشینە ، راکشینە .

* * *

شیعر چییە؟ چ رەنگییە؟ ژبۆی چییە؟
شیعر گولە با دۆست ویار،درکە ل
چاڤێ نەیار .
شیعر ئەوە ئاخ گڕێ سۆر،
ل دوژمنا بڕەشینە، ببارینە،
بپەشکینە ، بوەشینە .
شیعر ئەوەک بلڤینە، بهەژینە،
بڤەژینە ، ل رێ خینە .
گشت دوژمنا ، گشت دوژمنا
لناڤ خوونی بگەڤزینە .
ئوستیێ نەحەز بشکەستینە .
نەیار لناڤ مالا دلا
ئاخ دەرینە ، ئاخ دەرینە .
شیعر ئەوەک مەژی یێ مرۆڤ
چەکدار بکە، بگەهینە.
زۆقی چاڤێ نەیار بکە، بڕژینە.
نەیار ل سەر سێدار بکە، دالقینە
رێنموونییا دلدار بکە،ل رێ خینە

* * *

شیعر چییە؟ چ رەنگییە؟ ژبۆی چییە؟
شیعر وەکی هال هالێ دل
سۆر، گەڤەزە، گوڕولەزە،
وەک ئەرەزە، وەکی خوونێ ،
بۆی هەبوونی ، لناڤ دلێ
یێ دلحەزە.
خودان شیعر هەر نەبەزە ،
سەردکەڤە،
قەت نابەزە.

بەس بەک ..

# مەلای جزیری

دل یەکەدێ عێشق یەک بت عاشقان یەک یار بەس
قبلەدێ یەک بت قولووبان دلبەرەک دلدار بەس
من دبەندا زولفەکی دل دا بدەستێ پیرێ عێشق
لەودعێشقێدا کوبەست ئێحرامیەک زوننار بەس
تەرح وتەرزی یوونەزوننا روچەلیپا یەک ب یەک
لەومەزوننا روچەلیپا یەک تنێ یەکجار بەس
هن ژنک دیرێ ڤەتێن قەستا کەنشتێ هن دکن
نەی ژوان نەی ژڤانم من دەرێ خەممار بەس
گەرچی تێن رەقس وسەمایێ هەرسەحەرسەد نەی شەکەر
من دبەزما سورشرینان ئەوشرین رەفتار بەس
وەهچوالا گەوهەرن هاتن لیباسێ جسم وجان
من ژوان حوری سرشتان ئەوپەری روخسار بەس
حەوجەسێحرێ سامێری نینن کو
چەشم بەندا دلروبایان کاکولا عەییار بەس
بولبولان سەدگول دچاڤن چاڤ ل سەد گول دی دکن.
من دباغێ گولعوزاران یەک گولێ گولزار بەس
من دباغێ گولفرۆشان دی عەجەب رەسمەک غەریب
خارتەبعان گول ددەستن ، گولپەرستان خار بەس
ئەوجەفا دەرچوو ژحەدد زولماتەبرحەتتا بچەند؟
رەحمەکی جارەک نەکی هەی ظالم ئەڤ ئازار بەس
غەرقی دەریایێ گوناهین تەشنەیێ لوتفا حەقین
رەحمەتێ ئامورزگاروشەفقەیێ غەففار بەس
ئەهلێ دونیایێ سەراسەردژمنێن من بن " مەلا "
پشتەمێرێ من عەلی بی، حەیدەرێ کەررار بەس .

# گوڵە و تەبەق

ڕەسووڵ وەیسی

یەکێک لە نەخۆشی یەکانی گرینگی گاو مەڕە کە بە نەخۆشی زاروپێ ناسراوە ئەوجۆرە نەخۆشی یە لە پێشوودا نەناسرابوو، بەڵام ویرووسی نەخۆشی بەرە، بەرە توێژینەوەی لەسەر کرا تا سەدەی نۆزدەهەم کەتوانیان جۆری ویرووس بناسن و واکسێنی دژی ئەو دروست بکەن. ئەو نەخۆشی یە زۆرتر لە ئاسیا وئەفریقادا، دیتراوە .بەڵام لە وڵاتەکانی پیشکەوتوودا بەهۆی وەزعی تایبەتی ناوچە ئیزگای پزیشکی لە سنووری دەوڵەتاندا دادەمەزرێنن کە ئەو موسافیرانەی بۆ وڵاتەکەیان دەچن موعاینە و دژی نەخۆشی یەکانی واگیر واکسیناسیۆن و مایەکوبی دەکرێن .

هۆی نەخۆشی :

ویرووسێکە لە رەدەی (پیکۆڕنا) کە :

الف :ئەو ویرووسانە لە بەرامبەر پاستۆریزاسیۆن ـ دا کە ( کردەوەیەکی عیلمی یە بۆلەناوبردنی میکرۆب) حەساسن .

ب : لەبەرامبەر سەرمادا خۆ دەپارێزن ودە رایەڵی تیکەڵاودا تا ماوەیەک دەژین .

ج :لەبەرامبەروشکایی دا هێزوتوانای ویرووس جۆراو جۆرە.

د : لە بەرامبەر ئەسید وبازدا حەساسە.

هـ: لەبەرامبەر( اترو کلۆرۆفۆرم والکل) دا تا رادەیەک بەهێزو خۆڕاگرە.

ڕێگای لێگرتنەوە :

## ڕێگای لێگرتنەوە

بەهۆی لیکاوی زاروخواردەمەنی و هەروەها گۆشت،ویرووسی نەخۆشی پەرە دەگرێ. بەهۆی چوونە ژووری ویرووس لە ڕێگای زار، قورقوڕۆچکە و ریخۆڵە بۆناو لەشی ئاژەڵ هەروەها بەهۆی ئالف یا هەرجۆرە خواردەمەنێکی تر لە پەرەی زمان یاشوێنی دیکەی لەشی ئاژەڵ دەتوانێ نەخۆشی وەدی بێنێ.

ئاژەڵی حەساس :

## ئاژەڵی حەساس

لە هەل ومەرجی ئاسایی دا

١ـ گاو، مەڕ و بزن ئەو نەخۆشی یە زۆرتر دەگرنەوە.

٢- گیاخۆرانی کێوی (کارمامز، بزنەکێوی)حەساسن
٣- ئینسان کەمترحەساسە.
٤- یەک سمەکان ( تک سمی) وبالندەکان بەهێزن.

**نیشانەکانی نەخۆشی :**

## نیشانەکانی

پاش تێپەڕکردنی خولی نوستوویی کە ٤٨ سەعات یا کەمتر لەچوار رۆژانە پێش هاتی گشتی دەست پێ دەکا وئەو نیشانانە لە ئاژەڵدا وەدی دێن :

١- پلەی گەرما یا تین دەچێتە سەر.
٢- بێ ئیشتیایی .
٣- کەسادی .
٤- قەبز
٥- شیر تا $\frac{1}{3}$ کەم دەبێتەوە. وپاش تێپەڕکردنی ئەو چەند خاڵانە بلۆقەکان لە دەوروبەری سم، زار، وگوانەکانی ئاژەڵ وەدی دێن .

الف : بلۆقی زار: لە پەڕەی زبان و پووک ولێوو لیچی ئاژەڵ بلۆقی سوور دەبیندرێن کە پاشان سپی هەڵدەگەڕین ودەترۆقین و لەجێگای ئەواندا برینێکی سوور دەمێنێتەوە کە بەرگری لەجوونی تفاق دەکا لیکاوێکی زۆر لە زاری دێتەخوار کە ویرووسی تێدایە لە حاڵێکدا کە ئەگەر بە میکرۆبەکانی دوانیە تێکەڵاو نەبێ ئەو برینانە پاش چەند رۆژ سارێژ دەبنەوە .

ب : بلۆقەکانی دەورو بەری سم: ئەو بلۆقانەش هەروەک بلۆقی زارن بەڵام کەمێک چوکترن کە لەنێوان دوو سمدا دێنەدەرو دەبنە برین وئاژەڵ تووشی لاقە شەلە دەکا و لە هێندی کاتیش دا بەهۆی تێکەڵاوبوون لەگەڵ پیسایی ومیکرۆب، سمی ئاژەڵ کێموئادابێکی زۆر دەردەکا کە رەنگە ببێتە هۆی جیابوونەوەی بەشی شاخی سمەکە.

ج:بلۆقەکانی گوان: ئەو بلۆقانە وەکوو بلۆقی زارو بەدوای تێپەڕکردنی خولی سەرەتایی سەربەخۆ سارێژ دەبنەوە و وردە،وردە دەبنە هۆی ئەستووربوونی گوان دێن. بلۆق لە زۆر کاتدا لەسەر نووکی گوانەکانی ئاژەڵ دێنەدەر.

**نەخوشی گولە و تەبەق بەشیوەی جوراوجور سەر هەلدەدەن.**

الف : سووک و سادە (خفیف) لەئاژەڵدا دێنە دەر وپاش ماوەیەک بێ هیچ پێش هاتێک چاک دەبنەوە

ب :پرمەترسی: ئەو نەخوشی یە شێوەی سپتی سمی دێتەدەر، یانی ویرووس دەچێتە نێو خوێنەوە وبە زوویی دەبێتە هۆی مردنی ئاژەڵ. هۆی ئەم مردنە پێک هاتنی پێش هاتی پێشوو لە ئاژەڵ دایە کە ئەو پێش هاتنە بەشێوەی ختوتی نەکرۆزەیی "رەنگ خوڵەمێشی" یا رەنگی زەرد" کە بە قەلبی برین ناسراوە.

ج:زۆرجار بە چەشنێکی پرمەترسی لە دەزگای گواریش و نەفەس کێشاندا دەبێتە هۆی پێک هاتنی کێم وئاداب وزگەشورە کە لە ئاکامدا ئاژەڵ دەکوژێ.

**خولی نەخۆشی:**

## خولی نەخۆشی

لە هەل ومەرجی ئاسایی‌دا کە پێش هاتی دواینە لە گۆڕێدا نیە نەخۆش پاش دوو تا سێ حەوتوو چاک دەبێتەوە .بەڵام لە کاتێکدا کە پێش هاتی دواینە هەبێ رەوتی نەخۆشی درێژە دەکێشێ.

**بەرگری وچاوەدێری:**

بۆ بەرگری کردن لە

نەخۆشی بەشێوەی خـوارەوە، عەمەل دەکەین :

الف : کوشتنی ئاژەڵـی پاگر بە نەخۆشی، ئـــەم شێوە کردەوەیە لـــە لای ئێمەوە باو نیە .لەجێگایەـ کدا کە رەوتی ئابووری باشترە بەرێوە دەچێ.

ب :پێک هێنانی قەرەنتینە (ئیزگای موعاینەی پزیشکی

وچاوەدێری تایبەتی) لـەو ناوچەیەی دا کەنەخۆشی تێدایە وبەرگری لە هات وچـوی ئاژەڵ بۆئەم جۆرەشوێنانە تا ئاگاداری دوایی، بـۆ ئەوەی لەگەڵ هاتـوچـوی ئاژەڵ لە ناوچەدا نەخۆشی بڵاو نەبێتەوە و بۆلەناو بردنی ویرووسئەو شوێنانە سەمپاشی دەکـەن .

ج :مایەکوبی(واکسیناسیۆنی) ئاژەڵ بەتایبـــەت ئاژەڵی حەساس (گا ،مەڕ) بۆ بەرگری نەخۆشی .

چارە :

## چارە

بۆ بەرگری کردن لـــە چلکەکانی دوایینە(ئانویــە) دەتوانین لە :

١ـ ئانتی بیۆتیکەکـان .

٢ـ ئاوی سرکە .

٣ـ گلیسرین یۆد کەلک وەرگرین .

لەبابەت چلک کردنـــی سمی ئاژەڵ :

١ـ مەحلولی سولفاتـی مس

٢ـ قسڵاو .

٣ـ پتاس بەکار دێنن.

نەخۆشی تاعونی گا :

## تاعوونی گا

هەروەک لەنێوەکـــەی را دیارە یەکێک لەنەخۆشی یەـ کانی واگیری گاو گامێشە ئەو نەخۆشی یە زۆرتر لە ناوچەی جوغرافیایی ئاسیاو ئافریقادا دەبیندرێ کـە لەو ناوچانەرا دەناوچەکانی دیکەرا نفووز دەکـەن و دەبنە هۆی تێکەڵاوی توند و تیژ .

هۆی نەخۆشی :

## هۆی نەخۆشی

١ـ ویرووسی تاعـون بەشێکە لەرەدەی ویرووسەکانی گەورە ودرشت .

٢ـ ویرووسی تاعون لە بەرامبەر وشکایی وگەرمـادا حەساسە ولە ماوەیـەکـی کورتدا لە دەرەوەی لەشی ئاژەڵ لەناو دەچێ .

٣ـ لەبەرامبەر مەوادای دژی عفوونی بۆ هێز دەبـێ ولەناو دەچێ .

٤ـ لەبەرامبەر سەرمادا تا رادەیەک بەهێزە، بـە چەشنێک کە دەتوانـدرێ ویرووسلەتینی خوارەوەشدا تاچەند رۆژێک رابگرین .

دریژەی هەیە

تێبینی: لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (v) دانەنراوە واتا ئەگەر بۆوێنە وشەی (شڕ، کوڵ، زۆر، شەڕ و...) ی تێدا بێ بە شکڵی (شر، کول، زور، شەر و...) دەنووسرێ.

١- حاکمی ناوچەیەکی کورد نشینی تورکیا کە مەلیک ئەحمەدپاشای عوسمانی هێرشی کردە سەر وباسەکەی لە سیاحەتنامەی ئەولیا چەڵەبی دا هاتووە ٢- ئوستانداری قەدیم- سڵ ٣- تکا و لالانەوە- درەوشانەوەی ئەستێرە- دەنگی مار ٤- ناوێک بۆ کچ- سوور بۆ ترشە وسپی بۆ شیرنە- باهۆ ٥- کاس وگێژ- خاوەنی ئودیسەو ئیلیاد- شەرت وگرێو ٦- ڕەش و سپی - کەم نیە- حەرفێکی ئیزافەی کوردی ٧- دەرمانی هدلامەت - لەشین و تازیە سەریان تێدەنا- ناوێک بۆ کچ ٨- خاڵە !- نمایشتی بێگانە تاتی ولباد- پەز ومەڕ ٩ — هەوەڵین شوێنەواری چاپکراوی ماموستاهێمن - مەعدەن وکانگە ١٠- قەدیم لە ملی دیل و یەخسیر دەکرا وئێستا پیار لەبەری دەکەن - ساکار وبێ فێل - تراکتۆر هات و لەبرەی خست ١١- دەوروتەئسیر- خلوەتی ١٢- ناوچەیەکی بەناوبانگی بانە پارچەیەکی تەنکە بودەسمال - شانە ١٣- تووک ودوعا - دەریا- بوختان وئیفترا ١٤-توند نیە- شەخسێکی بەناوبانگی ناوچەی کرماشان ١٥- شارێکی کوردستانی عێراق واش هەر درۆیە.

١- قارەمانێکی بەیتی مەموزین - میوەی وا زۆر ناخۆشە وپەسند نیە- مات - قورعە ٢- مزگەوتێکی کۆنینەی شاری سنە- حەرفی ئیزافەیکوردی ٣- ئاواڵدوانەی پرش - شیعرێکی بەناوبانگی جگەرخوێن ٤- گوندوئاوایی- کتێبێکی ئاسمانی یە- ئەستێور ٥- زێرِوزەمبەر- سوورەیەکی قورئانی مەجید- کێوێکی بەرزی کرماشان ٦- کاری فاڵگرەوە- جۆرە فانتۆمێکە - دووپاتی بکەوە کایەیەکی منداڵانەیە ٧- ئەگەر بەمەعنا بۆ باشە- قەومێکە- کارێکی هەڵەیە ٨- قەفەز- قیتی بۆ گرێ - بنۆس وهەگەر ٩- قەست وعەزم- شارێکی کوردستان - شاخێکی بەرزی ناوچەی سەردەشت ١٠- شۆروشۆق - پێغەمبەرێکە لە پێغەمبەران - تووکی سەر ١١- ڕەواج- شنۆیی دەڵێ "وزەی ئێمە" - تلێت ١٢- وەرزشێکە- ڕێرەو- ئەستێرەیە -درشت نیە ١٣- گیایەکی بەهاری یە ولە دۆکلێو دەکری - باڵندەیەکی جوان و دەنگ خۆش - پەز-١٤- نووسەری بەناوبانگی تورکیا وخاوەنی کتێبی کوێرئۆغلێ و ئینجەمەمەدو ئەگەر مارەکە بکوژن و کاریتە و....- ئامرازی خەرمان هەڵاویشتن ١٥- بە شەکر و سرکە ساز دەبێ - بۆ باوک.

**لەنێو ئەو کەسانەیدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەمخاڵانەی خواروو لەبەرچاو بگرێ:**

**١- جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وا بێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە.**

**٢- ئەسڵی جەدوەلەکەمان بۆبنێرێ لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.**

**٣- لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆڤاری پڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.**

**٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ.**

**جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمانی گۆڤاری سروەیە.**

هەبوو نەبوو چ ژخودا مەزنتر نەبوو، روژەکی مهییەک لناڤ مێرگەکیدا مژوولی چەرینی بوو ، گورەکی برسی لناڤ ڤێ مێرگێرا دەرباس‌دبوو، چاڤێ وی ل مهییێ کەت ، دلێ خودا گوت :

- ئەز گەرە، بهەر جورەیێ هەیی ڤێ مهییێ بخوم. نشکێڤدا کرە گازی .

"ئای مهی تو بوچ لناڤ مێرگا مندا دچەری ماتو نزانی کو ئەو مێرگە پاوانێ منە؟

مهییێ گوت :

- چ! پاوانێ تەیە ؟

گوڕ گوت :

- بە، پاوانێ منە بەچ !؟

مهییێ گوت :

- پاوانێ تەیێ چییە؟ ئەوە چەند سالە کو ئەز لێرە دچەرم.

- تو ناڤ پاوانێ مندا دچەری، هێشتا ژی مەزن، مەزن دئاخڤی هان ؟!

مهییێ گوت :

- باشە، ئەگەر پاوانێ تەیە شاهدەکی بینە .

گور گوت :

- بەلێ، بەلێ، نە یێکێ بەلکوو هزاران شاهدا ئەزێ بینم.

مهییێ گوتێدا :

- ئەگەر تو راست دبێژی شاهدێ خو بینە .

گور گوت :

- ب وی شەرتی ئەگەر من شاهدێ خو ئینا ، گوت ئەو پاوانە پاوانێ گورگییە ئەزێ تە بخوم.

مهییێ گوت :

- باشە، کا بێژە شاهدێ تە کی یە .

گور گوت :

- شاهدێ من رڤی یە. لێرەبە ئەزێ نهە بچم ، بینم .

مهییێ گوٚت :
باشه هەرە بینه .
بەلیٚ گورگ چوو دوورڤی
مهییێ لالێ خوٚ فکر کر و گوٚته
خو گور بخوٚ کێم بوو رڤی ژی
لێ زیٚدە بوویه، چاریٚ من چییه؟
ئەز فکرەکی نەکم گور ورڤی دیٚ
بگەنە حسابا من، ئەز قەت نشیٚمه
پیلانیٚد وان.
بەلیٚ مهی ریٚکەت چوو بوٚ
لاییٚ گوند و هەوارا خوٚ بوٚ سەیی
بر. ژ لاییٚ دیقه ژی گور گهەشته
مالا رڤی ئیجا کانیٚ ئەم بزانن
چ دبیٚژیته رڤی.
گور گوٚت :
ـ مام رڤی تو حەز دکەی
ئیروٚکه نیٚچیرەکی بکەی .
رڤی گوٚت :
ـ ئەریٚ ولاهی بوٚ حەز ناکەم؟
باورکه لبرسادا نەشیٚم ریٚقه بچم

کا بیٚژە چ نیٚچیرە ؟ ته چ
پەیدا کرییه ؟
گور گوٚت :
ـ من پەزەک پەیدا کرییه
ییٚ ناڤ میٚرگا پشت گرکیٚ هەنیٚ
دایه .
رڤی گوٚت :
ـ باشه ئەوە چاوان بوو ته
هات گوٚته من ؟
ئاخر ڤهه ژی نینه، تشتەک هەیه
هەتانی ئەز نەزانم ناهیٚم .
گور گوٚت :
ـ سەریٚ ته چ پیلان ونەخشه
تیٚدا چنینه، هەر تنیٚ تویێ
بیٚژی کو ئەز شاهدم ئەوە چەند
ساله کو ئەو میٚرگه پاوانیٚ
گورگی یه، ڤیٚ هندیٚ زیٚدەتر من
چ لته نەڤیٚ .
رڤی گوٚت :
ـ باشه، ئەزیٚ بیٚم ئەمما

بشەرتەکی کو تو نەهدا پشکا من ئەز شاهدیا وی قەبوول ناکەم. بدەیی دیار کرن .

گور گۆت :

– وای سەر چاڤا، تو وەرە بلا دو پشک بۆ من بە پشکەک ژی بۆ تە بە چاوانە، هان ؟

رڤی گۆت :

– زۆر باشە دا بچین .

بەلێ ل ئالی یێ دیتردا ژی مهیێ حال و قسەت بۆ سەیی گۆت . ئەمما کانێ ئەم بزانن ئەوان چ نەقشەیەک بو گور و رڤی کێشانە .

سەیی گۆت :

– بەس وەرەنگ تو وەرە بچین ئەزی دیوانا وان بکەم. زوو بلەز رابە بچین هندی ئەوانە نەهاتنە.

مهیێ گۆت :

– باشە ئەم چ بکەن ؟

سەیی گۆت :

– ئەزێ بچم خۆ بکەمە بن قۆلە دارا ناڤ مێرگێدا، تو ژی هندەک پووش و پەلاشا باوێژە سەر من، وەختێ کو گورگ ورڤی هاتن تو بێژە حەتانی رڤی نەچە دەستێ خۆ ل قۆلەدارا هەنێ نەدەت،ئەز شاهدیا رڤی قەبوول ناکەم، ئەگەر گۆتن بۆچ؟ بێژە ئەو قۆلەدارا زیارەتە. حەتانی رڤی نەچە سەر و سووند نەخۆ،

بەلێ، حەتانی گورگ و رڤی هاتن سەیی خۆ بن قۆلەدارێدا ڤەشارت مهیێ هندەک پووش وپەلاش ژی ئاڤیتە سەر. گورگ و رڤی ژی هاتنە لالێ مهیێ .

گور گۆت :

– ئەڤەژی شاهدێ من، خوە ئێدی تە چ هەجەت چنینن. مام رڤی، دێ بێژە کو ئەڤ پاوانە یێ منە ئان نە.

رڤی گوت :

– سەرێ بابێ خو هندی دێ بیرا من ئەو مێرگە پاوانێ گورگی یە.

مهیێ گۆت :

– ئاخر ئەڤ قۆلەدارە، زیارەتە حەتانی رڤی نەچە دەستێ خۆ لێ نەدە ئەزقەبوول ناکەم .

رڤی گۆت :

- وای سەر سەرێ خۆ، نە جارەکی بەلکە سەد جارا ئەزێ بچم دەستێ خۆ لێدەم . ئەزو ئیمانا خو، ئەزو بەختێ خو ئەڤ دەرە پاوانێ گورگی یە . چاوان سووند ناخۆم.

بەلێ مام رڤی چۆ قەستا قۆلەدارێ کر. وەختێ کو نێزووکاتی دارێ کر نشکێڤدا دیت کو دو چاڤ یێ بن دارێدا دچرسکن، زۆر ترسییا و گۆت :

- ولاهی ئەز بێژم مهییێ راست دگۆت هە براستی ئەوە زیارەتا وانە.ئەگەر ئەز درۆدا، سووند بخۆم حەتمەن دێ من بگرە .

وەختێ کو رڤی کووشکە دی نێزووکاتی قۆلەدارێ کر، پێ حەسییا کو سەیە خو بلەز هاویت و هەلات و گۆتە گورگی وەلاه سووند ناخۆم، بچووکێد من هوور ن ئەز دترسم سووند م بگریت و زارووێد من ئێتیم وسێڤی بمینن گور گۆت :

- ئاخ نا سەرێ تەدا، بحەچۆکێ بحەچۆک، ئۆجاخ یانێ چ زیارەت چییە ؟ کوزوو جەرگێ تە قولپی. باشەئەزێ بخو بچم، سووند بخۆم .

بەلێ گورگ بخوە رابوو و قەستا قۆلەدارێ کر. وەختێ کو گهەشتە نێزووکی دارێ، ترسییا و دلێ وی لەرزی،راوەستا ئەمما دا بەردلی خوو گۆت :

- کورۆ دبێژنە من گورگ خوە ئەژی رڤی نینم .

دیسا چوو پێش کر کو دەستێ خۆ ل دارێ بدە و سووند بخۆ، سە ل بن پووشا دەرکەت و گەوری یا گورگ راگرت و کەتە سەر بێهنێ و ئەو گەڤزاند...

گورگ هە بزۆری شییا ب لەشەکی بریندار و کوتایی خو لناڤ لەپێ سەیی رزگاربکە و بهەلێ. وەختێ کو لناڤ لەپێ سەیی دەرکەت گازی رڤی کر وگۆتێ :

- ئای مام رڤییێ فێلباز تە چاوی زەر بن پووشدا دیت بوو. بەرڤێ هندێ تە سووند نەدخار؟ چ ناکە !!!

## مەتەڵ

کلکی باریک و دارە
دمی پانە وبەکارە

" پێمەڕە "

گای سووری
حەوت چەرم

" پیواز "

دیوێکی تاریک تاریک
تێی دا پیاوێکی باریک

" تیشکە "

بە سەتان
ریخۆلەیەکیان هەیە

" تەسحێب "

نە نالە نە بزمارە
پێچ پێچووکەی هەزارە

" فەرش "

نەڕێسراوە
نەپێچراوە
تەقەی دێ

" تەون "

# پەندی پێشینان

دەستێ مرۆڤ بشکێ چ نابە
دلێ مرۆڤ بشکێ چێ نابە.
دەستێ خەلقێ پشتا مرۆڤ
ناخورینە .
گڕێ کو خەلق ژ مرۆڤ را
بخورینە ،بێ فەیدەیە .
دەستێ دزا ،ب دزا نایێ
بڕینێ .
دەنگێ دهۆلێ دوورڤەڕاخۆشە.
درانێ کوٚرمی،دەرمان کێشانە.
گایێ رەش سپی نابە.
زۆرهات ،قەبالە بەتانە.
ژنێ بدە ژن مری یا ، گا
بدە گامری یا .
ژنا بێ کەس هاردبە ، مێرێ
بێ کەس ژار* دبە .
ژنا بێ بچووک بیهانییە.
ل خەزالێ بەزاتر چ حەیوان
چنە ،ئەو ژی ل قسمەتێ خۆ
زێدەتر ناخۆ.
ئەگەر ب مالی، ب خالەت
و خالی ،
ئەگەر بێ مالی،بێ خالەت
و خالی .
هەر کو کزە ، مێشال ور
ڤزە ڤزە .
ئاش شۆلا خۆ دکە ،چەقچە ـ
قۆک دەڤ وددانێ خۆ دشکێنە.
پێک هاتنا مشک وپشیکێ،
شینا کەبانی یێ یە .
خوون ب خوونی نایێ
شووتنێ .
گیهایێ حەوشێ تالە .
مردوو ئەگەر مرد لینگی درێژ
دەبێ .
کفن بەمن ببڕێ با مردوو گۆڕ
بەگۆڕ چێ .
زاری پڕ لەخوێن لە لای کەس
مەکەوە .
دەست نیە لەگۆزەی دا مابێ .
پشیلە لەماڵ نیە مشک تلی
لیانە .
دەستێک نەتوانم بیبڕم ماچی
دەکەم .
نان بۆ نانەوا ،گۆشت بۆقەساب
شیر وەشێن دەبێ قەڵغانێ پێ
بێ .
قسە کەوتە زارێکی دەکەوێتە
شارێکی .
گوێلکی خەڵکی هەر گوێلەوسارە.
خەوی لێ ناکەوێ بیانووی
کێچە .
پیاوی خۆهەڵکێش وەک سواری
بێ ئەسپە .
برۆ بۆشارێ‌کەس نەتناسێ
خۆت هەڵکێشە پڕبە کراسێ.
نە سەری تووری نەبنی گێزەری.
پێخواس ناتوانێ دڕکان بچێنێ.
گەورە ئاوێ دەڕژێنێ
گچکە پێی لێ دەخشێنێ.
تفی سەربەرەژوور وەنێو چاو
دەکەوێتەوە .
بەرز مەفڕە با نەوی نەنیشی.
بەرتیل بەردی نەرم دەکا .
گوتیان وشتر کوڕێکت بوو
کوتی باری خۆم هەرلە خۆمە .

**ژن :** پیاوەکە کوڕەکان گەورەبوون ووەختی ئەوە هاتووە ژنیان بۆبێنین .

**پیاو :** ئافرەت دووژنم پێ نایە . دەزانی چەندی پووڵ دەوێ ؟

**کوڕ :** بابە قەیدی ناکا ئەوساڵ بۆیەکمان بێنە و ساڵێکی دیکە بۆکاکم !

**قازی:** کابرا تۆ هەزارتمەنت لەم پیاوە دزیوە؟

**دز :** وەڵڵاهی نەمبژاردووە نازانم چەندی کەموزیادە وەباڵ بەستۆی خۆی .

**ژن :** کابرا بۆ درەنگ ، هاتوویەوە .

**پیاو :** ئیمڕۆ چاپەزی، ئیدارە لەبیری چووبوو وەخەبەرم بێنێ !

**باب :** ڕۆڵە جیژنانە چت بۆبکڕم ؟

**منداڵ :** چەکوچ ومشار وبزمار .

**باب :** نا ڕۆڵە ئەوانە نا شتێکی دیکە بڵێ .

**منداڵ :** بۆ؟

**باب :** چەکوچەکەی لەدەستی خۆت دەدەی !

**منداڵ:** نا بابە مەترسە ئەگەر بزماری دادەکوتم بزمارەکە دەدەمە دەست برا چکۆڵەکەم . من تەنیا چەکوچ لێدەدەم !

**باب:** کوڕم ئەمن ئاخری لەحەیفی تۆدەمرم

**کوڕ:** بۆبابە ؟

**باب:** هەرکە تۆ شلووقی ، دەکەی ئەمن موویەکی سەرم سپی دەبێ .

**کوڕ:**. خۆبەقەت تۆشلۆوقی ناکەم .

**باب :** ڕۆڵە کوا من شلۆوقم؟

**کوڕ :** چاولەسەری باپیرم بکە مووی ڕەشی لەسەریدا نەماوە !

**دوکتۆر :** پەرستار ! نەخۆش هەروڕێنە دەکا ؟

**پەرستار :** بەڵێ ئاغای دوکتۆر .

**دوکتۆر :** لەبەرەخۆیەوە ، دەڵێ چی ؟

**پەرستار :** دەڵێ تاوێکی دیکە عیزرایل دێ .

# فەرهەنگۆک

**راهات** :سروشت ،ئاسایی

**فیزیۆکراسی** :رێبازێکە کە رێڕەوانی ئەو، زەوی بە تەنیا سەرچاوەی ئابووری ژین دەناسن ، بەستە بە زەوی

**تابۆرە** : شێواز ، نەزم

**ئاویژە** :زەوی بەراو

**سێوک** : پەتاتە ،سێوزەمینی ، سێف زەمینی ، یەڕەڵما ، یەڕەڵماسی ، کارتۆل،کارتۆپی کرتۆپە

**کرۆسک** :هەرمێ کێویلە

**سەردێر** :تیتر

**شی کردنەوە**: تەحلیل ، شروفەکرن

**هەگەر** :هۆ ،عیللەت،سەبەت ، بنوس

**هەوێن** :مایە

**وەتی** :لەو دەمەڕا ، لەو دەمەوە

**ناسیاو**:ئاشنا ، ناسیار

**راوورووت** :غارەت، تالان

**شیاکە** :ریخ

**شتاق** :هیچکام

**نێوبژی** : بەڕیوانی ، ناوجێتی ، لیک کردنەوەی دوو کەس وەختی شەر

**گزە** : فێڵ،.تەڵەکە

**نەترە** :جوربوزە ،جورئەت غیرەت

**تەیمان** :پەرژین ، پەرچین

**قەڵغان** :قەڵخان ، سپەر، مەتاڵ

**گوێلەوسار** :هەوساری گوێلک ، گولک بەند

**رەخسان** :لوان ، گونجان

**کاسە و کەوێل** : قاپ و کەوچک

**لیک** : ئاوی زار ـ لیکاو، گلێز

**بلڤینە** :بلاوێنەوە ( لە مەسدەری لفاندن )

**بهەژینە** : بجوڵێنەوە ( لە مەسدەری هەژاندن )

**مەژی** : مەژوو ،مێژی، مێشک

**نەینووک** : خۆدیک، ئاوێنە

**دقلقلە** :دنەدەدا

**مەری** : مرۆڤ ، مەرڤ

**تریشک** : تیرۆژ، تیشک

**سەهـ** :هەست ، ئیحساس

**بپشکینە** : بپشکنە ( لە مەسدەری پشکینن )

**راقەتینە** : بتارێنە ( لە مەسدەری راقەتاندن)

**ریچال** :رەهـ، ریشە ، پنج

**هالهال** :گوڵاڵە ، لالە ،سوورگوڵ

**هیماندن** :فێر کردن

**سوورمل** : ( خطالراس ) جەمسەری کێو

**کۆرپە** : ساوا

**دڕک** :دڕوو ،دری، درک

**ئاسن رەڤین** :ئاسن رفێن

**خازیک** :حەسرەت

**حەژیک** :ئەڤین ، ئەوین

**گر** :ئاگر، ئاور، ئار،بڵێسە

**ئوستی** :ئوستو، سکور، ( مل)

**گەڤەز** :سووری گەش ، ئال.

**کورم** :کرم

**ژار**: هەژار

**گەڕۆک** :دەورەگەرد، سەیار

**بنتلینە** : بنەقشێنە ( لە مەسدەری نتلاندن)

**تۆژینەوە** :تەحقیق ، لێکۆڵینەوە

**ئاشێرە** : ئاماژە ، ئشارە ـ

**کلۆجێ** : ( کل وجە )

**پێ چڕ**: پێ داگر

**سەقامگیر** :بنەگرتوو ـ بنەگر

**بەرپەرچ دانەوە** :رەتکردنەوە

**بڕگەی مێژوویی** : پلەیەکی مێژوویی.(مقطع تاریخی)

**بەخڕی**: بەتەواوی ـ گشت لێکرا .

**شیپانە** : ساف

**گوێرە**: شکڵ ،قەوارە، فۆرم

**بێچم**: سەبک ،چوارچێوەونێوەرۆکی تایبەتی .

**ئەگەر**: لە بەیتەکانی کوردیدا زۆرتر بە مانای «کاتێک» بەکار هاتووە:

**ئەگەر خاتووزین چاوی هەڵێنا**: یانی

کاتێک خاتووزین چاوی هەڵێنا. جاری واش هەیە بە مانای "کە" بەکار دێ . وەک :

**دەشتەکەی شەمامکێ ئەگەر تیری تێ نەدەچوو لە بەر سەگەل و مێگەلان.**

شاری بانە: سەعید شەرافەتی (بانە)

کوێستانی عەنبەر: ئیسماعیل هەژار (عێراق)

سنوور: پەریزاد عەبدوڵڵا (شنۆ)

تاقەدار: سەلاح یۆسفی (مەهاباد)

شاری سەردەشت: سولەیمان عەبدی (سەردەشت)